د. کاوس قەفتان

چەند لێکۆڵینەوەیەک
لە مێژووی

# بابان .. سۆران .. بۆتان

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد
پێشەکیی بۆ نووسیوە

بەیارمەتیی کاک عەلی بۆسکانی لەچاپدراوە

د. کاوس قەفتان

# چەند لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی

# بابان .. سۆران .. بۆتان

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد
پێشەکیی بۆ نووسیوە

بەیارمەتیی کاک عەلی بۆسکانی لەچاپدراوە

**دوکتۆر کەمال مەزهەر**

شوێنی سەدەی نۆزدەمین لە مێژووی گەلی کوردو هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕاستدا تایبەتی‌یە • لەو سەدەیەدا ناوچەکە بەتەواوەتی تێکەڵی بازاڕی سەرمایەداری بوو • ئەو تێکەڵبوونە گەلێك ئەنجامی ئابووریو کۆمەڵایەتیو دیارە سیاسی‌ی بایەخداری لەگەڵ خۆی هێنا • لەناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیكو ناوەڕاستدا چینو دەستەی نوێ دروستبوون کە بە بیروباوەڕی تایبەتی‌ی خۆیانەوە هاتنە ناو کۆڕی خەباتەوە • پێوەندی دەرەبەگی زیاتر لە جاران بووە بارو ئەرك بەسەر شانی کۆمەڵانی خەڵکەوە ، بەتایبەتی دوای ئەوەی بەرهەمهێنان بۆ بازاڕ بووە هۆی پوکانەوەی خێرای ئەو پێوەندی‌ی باوکایەتی‌یەی جاران ئاغاو بەگو سەرەك هۆزی بە ڕەعیەتو دەستەو دایەرەوە دەبەستەوە • ئەندامانی دەستەی ڕووناکبیری نوێ چاویان بڕیبووە ئەستەمووڵو ئەودیوی ئەستەمووڵەوە ، بیریان لە دروشمەکانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە دەکردەوە ، پێشکەوتنی ئەورووپاو پاشکەوتنی خۆیان ناخی دەروونیانی دەهەژاند • تا دەشهات وڵاتە گەورەکان زیاتر ڕەگیان لەناو خاکیاندا دادەکوتاو چاوچنۆکانەتر بەردەبوونە خێرو بەرەکەتو سامانی نیشتمانیان •

ئەوانە بەس بوون بۆئەوەی لە سەدەی نۆزدەمیندا خەباتی گەلانی ڕۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست بگەیننە ئاستی خەباتی ئازادیخواو دیموکراسیپەروەرانە • بەلام زۆرو ستەمی قاجارییانی ئێران و عوسمانییانی تورکیا کارێکی ئەوتۆی کردبوو خەباتی کوردو عەرەب و ئەرمەن و ئازەری و گەلانی بەلکان (*) لەو ئاستەش تێپەڕێت و بگاتە ئاستی خەباتی ڕزگاریخوای نەتەوەیی • لەو سەدەیەدا بابان و سۆران و بۆتان و بادینان و موکریان و شەمدینانی کوردستانی لای خۆمان چەندین ڕاپەڕینی گەورەو هەراوبگری خوێناوییان بەخۆیانەوە بینی • هەر لەو سەدەیەدا سەردارانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای گەلی کورد بۆ یەکەم جار لە مێژوودا سەربەخۆیی و جیابوونەوەیان لە ئێرانی عەجەم و ولاتی عوسمانی کردە دروشمی خەباتی ڕەوایان • دیسان هێشتا سەدەی نۆزدەمین کۆتایی نەهاتبوو کاتێك دەنگی « کوردستان »ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیی بەرزبۆوەو سەرەتایەکی نوێی بۆ نەخشاندین •

لەبەر گەلێك هۆ بەداخەوە زۆر لاپەڕەی بایەخداری تۆماری ئەو ڕوداوانە ونن • بڕواناکەم لە سەرانسەری کوردستاندا خوێنەوارێکی ئەوتۆ هەبێ چەندین جار ناوی بابان و سۆران و بۆتان بەر پەردەی گوێی نەکەوتبێ • هەرسێکیان بوونەتە ناوی ئەفسانەیی پڕ لە ئاوازو شانازی لە زمانی کوردیدا • کەچی ئینجا هەموومان تاوەکو ئیستەش ، زۆر بەداخەوە ، شتێکی ئەوتۆیان دەربارە نازانین • لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژگارە ناسکە ، وەك هەموو لاپەڕەکانیتری مێژووی گەلی کورد ، پێویستیان بە

---

(*) بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان بە هەموو ولاتی بەرفراوانی عوسمانی ، بە بەلکانیشەوە ، دەگوترا ڕۆژهەلاتی نزیك •

لێکدانەوەو تەتەڵەو هەڵسەنگاندنە • چارەنووسی مێژوونووسی کورد وەك چارەنووسی گەلەکەی خەباتی درێژخایەنی بێوچانە ، دەبێت بە دەرزی بیر هەڵکەنێت ، شەونخونی بکێشێت ، لە هەموو دەرگاو بووارەکان بدات • قەرزی گەلو نیشتمانە دەبێت بیداتەوەو لە قۆرتو هەڵەنگوتن سڵ نەکاتەوە •

دەمێکە دوکتۆر کاوس قەفتان بەهۆی چیرۆکە بەپیتەکانی‌یەوە بۆتە ناوێکی ناسراو لای خوێندەواری کورد • بەڵام دڵسۆزان مێژووشیان لە کاك دوکتۆر دەوێت ، بۆیەکا لەوە دڵنیام « بابانو سۆرانو بۆتان »ەکەی چاوو دڵی هەموان ڕووندەکاتەوە • دیارە دەبێت ئەم بەرهەمەی دوکتۆر کاوس قەفتان سەرەتا بێتو بە زانیاریو لێکدانەوەی‌تر موتوربەبکرێت تاوەکو بتوانرێ هەموو مێژووی ئەو سێ میرنشینە گەورەیەی کوردستان چۆن پێویستە وەها تۆمار بکرێت • بێگومان مایەی بەختەوەری دەبێ گەر دوکتۆر کاوس بۆ خۆی ئەو ئەرکە پێویستەش بگرێتە ئەستۆ •

● ★ ●

# چەند سەرنجێك
# دەربارەی میرنشینی بابان

گەر بەووردی سەیری مێژووی میرنشینی بابان بکرێ ، هەست بەوە دەکرێ کە لەونێوانەدا بەدەگمەن هەواڵی ڕاستەقینەی بێ گەرد بەرچاو دەکەوێ ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لێکۆڵینەوەیێکی تایبەتیو سەربەخۆی قووڵیوا نی یە کە هەموو لایەنێکی ئەم میرنشینە بگرێتەوە .

میرنشینی بابان پتر لە دووسەد ساڵ مایەوەو دەورێکی ئاشکرای هەبوو . بەڵکە هەندێ جار ، بەتایبەتی کە دەسەڵاتو توانایان پەرەی دەسەند ، شەڕو شۆڕیان لەگەڵ وولاتی فارسو مەمالیکەکانی ژێردەستی عوسمانی یێکان دەکرد ، هەندێ جار ئەو شەڕانە گەرم دەبوونو تەشەنەیان دەکردو مەسەلەی کوردیان دەبزواندو دەخستە بەر چاوو دەم ، کار لە چوارچێوەی شەڕی ناوخۆیی دەردەچوو و دەبووە کێشەیێکی جیهانی : ئەوەبوو ئیمپریالیزمی بەریتانیا دەستی خستە ناو کاروباری ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی فارس ، هەروەها کوردستانیش ، بەونیازەی بەرژەوەندیی ئابووری خۆی لەو ناوچانەدا بپارێزێو لە

هەمان کاتیش‌دا بەربەستی پەرەسەندنی دەسەڵاتی ڕووسیای قەیسەری لەو ناوچانەدا بکا[1] •

ئەم میرنشینە گەلێك ڕووداوی تێدا ڕوودا ، بووە شانۆیێکی شەڕوشۆڕو کارەساتی تراژیدی کە کەمی لێ باس کراوەو گێڕراوەتەوە ، مەگەر شاخی پیرەمەگروون زمانی لێ بڕوێو بێتە ئەمین زەکیو توانای نووسینی ڕاستو ڕەوانی هەبێ[2] • مێژووی میرنشینی بابان هەیە ، واتە باسو هەواڵی میرەکانیو شەڕو شۆڕەکانیان زۆربەی نووسراوەتەوە ، بەڵام مێژووی ئەم میرنشینە هەر ئەوە نی‌یە •

ئەوی ڕاستی بێ گەلێ سەرچاوەمان دەربارەی مێژووی ئەم میرنشینە چنگ‌دەکەوێ ، کە بەکورتیو درێژی لە سەرەتای دروست‌بونی‌یەوە ، هەموو ئەو شەڕو شۆڕو دەسیسەو خۆفرۆشتنو یەك‌فرۆشتنی ناو بنەماڵەی بابانو داڕزانو نەمانی ئەو میرنشینە باس‌دەکەن[3] ، بەڵام بەدەگمەن وێنەیێکی ڕوونو ڕاستەقینەی ئەو میرنشینەمان دەدەنێو بەدەگمەن‌تر باسی هەموو ئەو هۆ نهێنی‌یانە دەکەن « واتە هۆ سیاسیو کۆمەڵایێتیو ئابووریو نەتەوایێتی‌یەکان » کە لەڕاستی‌دا بریتی‌بوون لەو هێزانەی چەرخی مێژووی میرنشینەکەیان دەسووڕانەوە •

---

(١) عبدالعزيز سليمان نوار ، تاريخ العراق الحديث ، القاهرة ١٩٦٨ ، ص١٠٠ •

(٢) محمد امين زكي ، تاريخ سليمانیو ولاتی بەغدا ، ١٩٣٩ ، ئەم کتێبە تەرجەمەی عەرەبی کراوە ، بڕوانە ( تاريخ السليمانية ، وضعه باللغة الكردية محمد امين زكي، نقله الى اللغة العربية الملا جميل الملا احمد الروژبياني ، بغداد ، ١٩٥١ ) •

(٣) بڕوانە ، مێژووی سلێمانی ؛ لۆنگریك ، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ؛ رحلة ريج في عام ١٩٢٠ ؛ توفيق قەفتان ، مێژووی حوکمدارانی بابان •

ئەمین زەکی لەمڕووەوە باووباپیران تاوانبار دەکا ، کە هیچی وایان بەجێ نەهێشتووە ڕێگا ڕووناك بکاتەوە ، هەرچی ئەدمۆندزە ئەوە زانا کوردەکان تاوانبار دەکا ، ئەوانەی بەلای ئەوەوە تەنیا پشت بەو ڕووداوو باسانەوە دەبەستن‌و دووبارەیان دەکەنەوە کە نووسەرە بێگانەکان نووسیویانەتەوە ، ئاوڕنادەنەوە لەو سەرچاوە بنەڕەتی‌یانەی بەردەستیان(٤)، واتە ئەو هەموو باس‌و ڕووداوانەی لە دڵ‌و دەروون‌و مێشکی دانیشتووانی کوردستان‌دا ماوەتەوەو سەر کاغەزیان نەدیوە ، بەلاّم ڕاستی‌یێکەی ئەوەیە کە هێشتا ئەو نووسراوەمان نی‌یە ڕووداوو لێکۆڵینەوە بخاتە تەك یەك‌و وێنەیێکی ڕاست‌و ڕەوانی ئەو سەردەمەمان بخاتە بەردەم •

مێژووی میرنشینی بابان کۆنە ، دەگەڕێتەوە پێش درووست بوونی قەلاّچوالان‌و سلێمانی ، هەروەها ناوو ناتۆرەی بنەماڵەی بابان‌و بەسەرهاتیان کۆنەو گەلێك مێژوونووس دەربارەیان دواوە •

لەو سەدانەی میرنشینی بابانی تێدا درووست‌بووە دوو ئیمپراتۆری‌یەتی گەورە لەکایەدا بوون ، هەردووکیشیان بەتیژی لەپێناوی دەستگیرکردنی ڕۆژهەلاّتی نزیك‌دا هەوڵیان‌دەدا ، لە ڕۆژهەلاّتی نزیکیش‌دا ، کوردستان بەگشتی‌و میرنشینی بابان بەتایبەتی ، لەپێشی پێشەوە لە ناوجەرگەی ئەم زۆران‌بازی‌یەدا بوو ، نەك لەبەرئەوەی ئەم میرنشینە ژمارەی دانیشتووانی زۆرەو سامانێکی زۆری بەخێروبێری هەبوو ، یان شوێنەکەی ستراتیژی‌یەو لە ناوچەکانی‌تری کوردستان گەورەترو گرنگ‌ترە ، بەلّکو لەبەرئەوەی کەوتبووە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆری‌یەتەوە ، وە هەردووکیان لەسەر داگیرکردنی ــ کە دواڕۆژی هەموو عێراقی لەسەر وەستابوو ــ لە شەڕدا بوون ، لەبەرئەوەش کە میرنشینێکی بەهێزو دەسەلاّت‌و خاوەنی سوپایێکی

(٤) سی • جی • ئیدمۆندز : کوردو تورك‌و عەرەب • لاپەرە ٥٦ • (بە عەرەبی) •

ناو بــه گــەورەیی‌و مەشق‌چاکی‌و ئازا دەرچوو بوو[٥] ، جگە لەوەش پاشاکانی ئەم میرنشینە خاوەنی ئامانج‌و هیواو هەستی نەتەوایێتی خـۆیان بوون ، هەمیشە چاویان لەوەوە بوو کە میرنشینی بابـان بکەنـە بەردی بناغەی دامەزراندنی دام‌و دەستگایێکی گەورەی کوردی سەربەخۆ .

هەوڵ‌و تەقەلاکانی سلێمان بەبەی گـەورە لەو ڕووەوە باشـترین نموونەیە ، کە دەیویست بکاتە دام‌و دەستگایێکی کوردیی سەربەخۆ ، داگیرکردنی وولاتی ئەردەلان یەکەم هەنگاوێکی بوو بۆ ئەو مەبەسـتە ، ئەو میرە بەناوبانگە دەسەلات‌و زەبروزەنگی گـەیشتبوە ڕادەیێـکی‌وا ، دەوڵەتی عوسمانی سڵی لێ دەکـردەوەو دەترسـا بەتەنیـا پەلامـاری‌بدا ، لەبەرئەوە لەگەڵ ئێراندا یەك لەدوای یەك پەلاماریان‌دەدا تا ساڵی ١٦٩٩ بەسەری‌دا زاڵ‌بوون[٦] .

ئەو ئامانجە واتە داگیرکردنی وولاتی موکری‌و ئەردەلان لە مێشك‌و دڵ‌و دەروونی میرەکانی بابان‌دا جێگیر ببوو پشـتاو پشـت دەمایـەوە ، ئەوەبوو بەکر بەگی میری بابان کە بە ئیسلاحاتی ناوخـۆو دەرەوە ناوی دەرکردبوو ، لە سەرەمەرگیش‌دا هێنانەدی ئەو ئامانجەی لەسەر دەم بوو کە ووتبووی « ئەوەی ئەو ئامانجە بهێنێتەدی لەو دنیاش بێ ، دڵی پــێ خۆش‌دەکەم »[٧] .

عەبدورەحمان پاشای بەناوبانگی میرنشـینی بابـان ، دیسـانەوە نموونەیێکی ئاشکرای ئەو مەبەستەیە ، ئەم میرە تووانی دەوڵەتی عوسمانی

---

(٥) عبدالعزيز سليمان نوار ، داود پاشـا والي بغـــداد ، القاهرة ، ١٩٦٨ ، ص٣٦ .

(٦) سالح قەفتان ، مێژووی گەلی کورد ، بەغدا ، ١٩٦٩ ، ل ٣٠٧ .

(٧) مێژووی حوکمدارانی بابان ، بەغدا ، ل ٤٠ .

بهێنێته لەرزینو له دەوری ئەمدا میرنشینی بابان گەیشته ئەوپەڕی بەهێزیو سەربەخۆیی تەواو(٨) ، هەر لەبەرئەوەش بوو کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بەدرێژایی بیستوسێ ساڵ وازیان لێ نەهێناو هەمیشه دەچوون بەگژیدا ، ڕێگا نەما نەیگرن بۆ دەرەقەت هاتنی : چ به ئەمو ئەو کڕین بێ چ به سوپا ناردنو دەسیسەکردن بێ •

گومان لەوەدا نی‌یه که میرەکانی بابان سوودێکی باشیان له جۆری هەڵکەوتنو جێگا باشی میرنشینەکەیان وەرگرت ، چونکه میرنشینەکەیان کەوتبووه نێوانی هەردوو ئیمپراتۆری‌یەتەکەوەو لەسەر دوو پەت یاری‌یان دەکرد(٩) ، ئەم یاری‌کردنی سەر دووپەته تەنیا لەبەرئەوه نەبوو که میرنشینەکەیان له نەمان بپارێزن بەڵکه بەونیازەش که بەرەبەره بەگوێرەی سیاسەتو توانای ئەوڕۆژه فراوانو بەهێزی بکەن تا بتوانن بگەنه ئەو ئامانجەی دەستنیشانمان کرد •

میرەکان بەگوێرەی توانا هەوڵیان‌دەدا ئەو قورسایی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی‌یەی مەرکەز کزبکەن بەو هیوایەی لەژێر سێبەری بنەدەرێو ڕزگاری‌یان ببێ ، هەروەکوو خاڵفین نووسیویتی ، بەرەبەرەکانێی گەلی کورد بەنیازی ڕزگاربوون له چنگ دەسەڵاتی حکوومەتی مەرکەزی لەڕێی دەرەبەگه نیشتمان پەروەرەکانی کوردەوه پەرەی‌دەسەند(١٠) ، میرەکانی بابانیش لەو دەرەبەگه نیشتمان‌پەروەرانەی کورد بوون که ئامانجی ڕزگاربوونو سەربەخۆیی گەلی کورد کۆی کردبوونەوه بۆ کارکردن لەوڕووەوه •

---

(٨) ئەدمۆندس ، ل ٥٤ •
(٩) نوار ، داود پاشا ، ص ٣٦ •
(١٠) ن • ئا • خالفین ، خەبات له ڕێگەی کوردستان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ل ١٩ ، « به زمانی ڕووسی » •

له سالی ١٦٢٩دا کوردستان لەسەر بناغەی شیعەو سوننی مەزەب لەنێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئێراندا دابەش کرا ، بەوپێیە کوردستانی خووارو و شارەزوورو میرنیشنی بابان بەر دەوڵەتی عوسمانی کەوتن • هەر لەوساوە هەوڵو کۆششی میرەکانی بابان بۆ بەهێزکردنو پەرەپێسەندنی سەربەخۆیی میرنشینەکەیان دەستی پێکرد • گەر جاروبار خزمەتگوزاری دەوڵەتی عوسمانی بووبن یان گەلێ جار لەڕوویدا هەلگەڕابنەوە ، یاخود گەلێك جار پەنایان بردبێتە بەر ئێران یاوەکوو دەستەویەخەی ئەویش بووبن ، هەمووی لەپێناوی خزمەتکردنو بەهێزکردنی میرنشینەکەیاندا بووە •

میرەکانی بابان لەوە دڵنیابوون کە ئەگەر یەکێك لەو دوو دەوڵەتە گەورەیە بەسەر ئەویتریاندا زاڵ بێو دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ لەناوی‌ببا ، ئەوە لەپێش هەموو شتێکەوە میرنشینی بابانی تێدا دەچێو بەئاسانی قووتدەدرێ ، لەبەرئەوە زۆر جار یارمەتی هێزەکانی ئێرانیان دەدا تا هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەربکەنو ناوو دەسەڵاتیان کزبکەن ، کە ئەوەیان بۆ دەچووەسەر ئنجا ئاوڕیان لە هێزەکانی ئێران دەدایەوەو پەلاماریاندەدان ، بەوجۆرە ئێرانو دەوڵەتی عوسمانی چەند یەکتریان لاواز دەکرد میرنشینی بابانیش ئەوەندەیتر ئاگری ئەو لاوازبوونەی نێوانیانی خۆش‌دەکردو بەشداری لاوازکردنیانی دەکرد •

پەنابردنی میرەکانی بابان بۆ بەر دەوڵەتی عوسمانی یان ئێران تەنیا لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی میرەکان خۆیان نەبوو وەك لەڕواڵەتدا وادیارە ، بەڵکوو لە چوارچێوەیێکی فراوانتردا بوو ، ئەوەبوو سالی ١١٣٩ك کاتێ سوپاکەی ئەشرەف‌خانی‌ئەفغانیو دەوڵەتی عوسمانی چوون بەگژ یەكدا ، هێزی کوردەکان بەتایبەتی هێزی میرنشینی بابان لەتەك

هێزی دەوڵەتی عوسمانیدا ئازایانە کەوتنە شەڕەوە ، بەڵام کاتێ عوسمانییەکان گەیشتنە ئەوەی تەواو سەربکەون ، کوردەکانی بابان بە سەرۆکایەتی خانە پاشا کشانەدوواوەو وازیان لە سوپای دەوڵەتی عوسمانی هێنا ، بەوە عوسمانییەکان شکان ، ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو کە سەرۆکە کوردەکان پارەیان وەرگرتبێ وەکوو خاوەنی « دوحة الوزراء » دەڵێ ، بەڵکوو لەبەرئەوە بوو کە دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی لەکەدارو زەرەرمەند بێو نەیەڵن لەوە زیاتر فراوانو خاوەن دەسەڵات بێ(١١) .

بابانەکان لەوە دڵنیابوون کە سەرکەوتنی عوسمانییەکان لەو شەڕەدا ، دەبێتە هۆی لاسەنگبوونی تەرازووی هێزەکانی ئەو ناوچەیەو ئەوەش لە بەرژەوەندیو چاکەو سوودی میرنشینی بابان نەبوو ، هەروەها کاتێ کە دەوڵەتی ئێران بە پەیدابوونی نادرشا دەسەڵاتی پەیداکردو گەیشتە ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە عێراقدا لەناوبەرێو لەوانەبوو ئەمە ببێتە هۆی ئەوەی لە مەیدانی ئەو ناوچەیەدا لە هێزی ئێران بەولاوە هیچ هێزێکیتر نەبێ ، میرنشینی بابان کەوتە پەلاماردانی سوپاکەی نادرشاو پشتی دەوڵەتی عوسمانی گرت(١٢) .

کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانیش بەتەنیا یان بەیەکەوە چییان لەدەست هاتبێ درێغیان لەوە نەکردووە کە میرنشینی بابان بە

---

(١١) الشيخ رسول الكركوكلي ، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء ، بيروت ، ص٢٣ «نقله من التركية الى العربية موسى كاظم نورس » .

(١٢) لە گفتوگۆکەی نێوان نادرشاو سەلیمبەگی باباندا بۆمان دەردەکەوێ تا چڕادەیێك میرەکانی بابان شانازییان بە وڵاتو خاكو نەتەوەوە کردووە . بڕوانە « مێژووی حوکمدارانی بابان ، ل ٥٣ ـ ٥٦ » .

دەستەپاچەیی‌و کزی بهێڵنەوە ، خۆ ئەگەر لەڕێی شەڕو بەکارهێنانی سوپاوە ئەوەیان بۆ نەچووایەتە سەر ئەوە لەڕێی دووبەرەکی‌نانەوەوە لەنێوان ئەندامانی بنەماڵەی باباندا هەوڵیاندەدا بگەن بەو نیازەیان •

هەر لە سەردەمی پەیدابوونی نادرشاوەو بە هەوڵ‌و تەقەلای نادرشا خۆی ، بۆ یەکەمجار تۆوی دووبەرەکی لەنێوان خزم‌و کەس‌و کاری ئەم بنەماڵەیە چاندرا ، هەر ئەو بوو توانی سەلیم‌بەگ بخەڵەتێنێ‌و لە میری بابانی ئامۆزای ڕاست‌بکاتەوە ، هەر لەوساوە ئەو نەریتە ناشیرین‌و کوشندەیە کەوتە بنەماڵەی بابان‌و بووە ماکـی لاوازکردن‌و دوایی تێداچوونی میرنشینی‌یەکە •

کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیش هەر لەوساوە ئەو نەخۆشی‌یەیان کردە داردەست‌و هەمیشە باوك‌و کوڕو براو ئامۆزایان لەیەك دەکردە دوشمن ، بەونیازەی میرنشینی بابان هەرگیز نەبێتە خاوەنی هێزێکی‌وا کە مەترسی هەبێ بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی ، نەك هەر ئەوە •• بگرە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی هەرگیز ڕێگایان نەدەدا میرێ لە میرەکانی بابان ببێتە والی بەغدا تا میرنشینی بابان دەسەڵاتی زۆرتر پەیدا نەکاو نەبێتە مایەی سەرێشە بۆ ئەستەمبوڵ(١٣) ، بەڵکوو هەردوو دەوڵەتەکە ، واتە ئێران‌و عوسمانی ، لە برایان‌و کوڕانی میرەکانیان بە دەست‌بەسەری دەبردە کرماشان یان بەغداو لەوێ دایاندەنان تا میرەکانی بابان چاوترسێن بکەن‌و لغاویان بکەنە دەم •

بەدرێژایی ئەو مێژووە میرنشینی بابان ، بەرزی‌و نزمی ، فراوانی سنوورو گرژی سنووری بەخۆیەوە دی ، بۆنموونە جاری‌وا هەبوو

---

(١٣) نوار ، داود پاشا ، ص٣٦ •

فراوانی دەگەیشتە ئەوەی هەرێمی سلێمانیو کەرکوكو هەمەدانو کۆیەو قەسری‌شیرینو زەهاو بگرێتەوە ، بەڕادەیێکیوا کە لۆنگریك ناوی بنێ ئیمپراتۆری‌یەتی بابان(١٤) .

ئەم میرنشینە دەیتوانی دەورێکی گەورەو بالاتر ببینێ ، بەتایبەتی پاش هیلاكبوونو لاوازبوونی هەردوو ئیمپراتۆری‌یەتەکە لەئەنجامی چاوبرسێتی ڕوسیای قەیسەری ، ئەو چاوبرسێتی‌یەی سنووری بۆ نەبوو ، ئێرانو دەولەتی عوسمانی پەرێشان کردبوو ، جا ئەوڕۆژانە باشترین هەل بوو بۆ میرنشینی بابان تا ئامانجە نەتەوایێتی‌یەکانی خۆی بهێنێتەدی ، بەلام کاتێك دوو دەولەتەکە هیلاك بوون : ئەمارەتی بابانیش لەتەك ئەوانەوە پەکی کەوتبوو بەهۆی ئەو هەموو دووبەرەکیو یەك‌خواردنو شەڕو شۆڕەی بابانەکان خۆیان لەسەرێکەوەو ، هەردوو دەولەتەکەی ئێرانو عوسمانی لە سەرێکی‌ترەوە کە شانۆی پێك‌دا هەلپژانەکانیان میرنشینی بابان بوو .

دوای ڕاپەڕینەکانی عەبدوڕڕەحمان پاشا کە هەلگری باوەڕو هەستی نەتەوایێتی بوو و بە هیوای فراوانکردنو سەربەخۆیی میرنشینی بابان بوو ، میرنشینەکە تەواو هیلاك بوو ، ئیتر میرەکانی بابان نە ئەو تواناو نە ئەو هەستە بەجۆشەیان نەما کە داموو دەستگا کوردی‌یە سەربەخۆکە دابمەزرێنن .

بێ‌گومان گەر لەمە ووردبینەوە ، دەبینین گەلێ کۆسپ ڕێگای هێنانەدی ئامانجەکانی میرنشینی بابانی دەگرت ، لەسەرێکەوە چ ئێرانو چ دەولەتی عوسمانی گەر کار بگەیشتایەتە ئەوەی میرنشینی بابان بگاتە

---

(١٤) لۆنگریك ، ل ٢٤٩ .

ڕادەی دەسەڵاتو سەربەخۆیی تەواو کە بێتە هێزێکی سێیەم لە ناوچەکەداو تەنگ بە هێزەکانی ئەوان هەڵچنێ ، ئەوە بەجووتە دەکەوتنە گیانیو بە هەزار فڕوفێڵ بەربەستییان دەکرد بەتایبەتی کە دەیانزانی میرنشینەکە دەبێتە مەشخەڵێكو ناوچەکانیتری کوردستان بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێ ، لە سەرێکیتریشەوە سیاسەتی ئەوڕۆژانەی جیهانیش کۆسپێکیتر بوو ، هەرچەندە ئیمپریالیزمی بەریتانیاو ڕووسیای قەیسەری حەزیشیان دەکرد ئێرانو دەوڵەتی عوسمانی پەرێشان بن ، بەڵام نەك تا ئەوڕادەیەی پارچەیەکیان لە ڕۆژهەڵاتی نزیكدا لێ جودا بێتەوە ئەگەر هی خۆیان نەبێو بۆ خۆیان نەبێ ، دەردی دووبەرەکیو خۆفرۆشتنی هەندێ لە میرەکانی بنەماڵەی بابانیش لەولاوە بوستێ .

ئەگەر ئەو دووبەرەکییە نەبوایە ، نە ئێرانو نە عوسمانییەکان چارەسەری میرنشینی بابانیان پێ نەدەکرا ، ئەوەتا **ئەحمەد پاشای** میری بابان پەنجە دەخاتە سەر ئەو زامەو بە ڕیچ دەڵێ ، ئەنجامی دووبەرەکی میرەکانمان تێداچوونی خۆمانە ئەگینا ئێرانو عوسمانییێکان دەرەقەتمان نەدەهاتن گەر ئەم دووبەرەکییەیان نەکردایەتە هەلو داردەست بەدەستیانەوە(١٥) .

دووبەرەکیو شەڕوشۆڕی نێوان میرنشینی بابانو میرنشینەکانی دراوسێی وەکوو میرنشینی سۆران ، ئەمیش کۆسپێکیتر بوو ، لەجێی ئەوەی ئەو هێزانە یەكگەون ، بە پارچە پارچەییو ناکۆکی مابوونەوە کە ئەم هۆیەیان نەك بووە مایەی لاوازی میرنشینە کوردەکان بەڵکە بووە هۆی تێداچوونی میرنشینەکانیشو بەهێزبوونی ئێران بەگشتیو دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتیو سەرکەوتنیان .

---

(١٥) ریچ ، ص٦٣ .

له سەرێکی تریشەوە ناوچەی میرنشینی بابان وەك باسمان کرد کەوتبووە شوێنێکەوە، ببووە شانۆی بەیەکدا هەڵپژانی سوپاکانی دەوڵەتی عوسمانیو ئێران، کە ئەمەش زیانێکی زۆری بە میرنشینەکە ئەگەیاندو دانیشتووانی ناوچەکە حاڵێکیوایان بەسەردا هاتبوو ئیتر گوێنەدەنە زیانێکی دامەزراوی پڕئاسوودەیی پێشکەوتوویوا کە کشتوکاڵو بازرگانی تێدا گەشەبکات .

یەکێك لە کاربەدەستانی میرنشینی بابان ئەو هەستەی بەئاشکرا بۆ ڕیچ دەرخستبوو بەوەی پێیووتبوو، ماڵ بۆ درووست بکەینو چاکی بکەینەوەو دەستی پێدا بهێنین، لەکاتێکدا کە لەوە دڵنیا نین تا سەر تیایدا بژین، ماڵوێرانی ئەم وولاتە لە بێئاسایشیدایە(١٦) .

بەهۆی ئەو دواکەوتنی دۆخی ئابووریەوە، دۆخی کۆمەڵایێتیش دواکەوت، ئەمەش بووە کۆسپ لە ڕێی پێشکەوتنو پێگەیشتنی میرنشینی بابان، چونکە دوواکەوتنە کۆمەڵایێتییەکە لەئەنجامی دۆخە ئابوورییە دوواکەوتووە پەرێشانەکەوە بوو .

شتێکی ئاشکرایە کە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگای میرنشیی باباندا هێجگار سەرەتاییو دواکەوتوو بوون، ڕژێمی چینایێتی دەرەبەگایەتیش هێندیتر دۆخی ئابووری بەرەو وەستانو شێوان ئەبرد، ئاغا تا دووا دڵۆپ خوێنی جووتیاری دەمژی، میرەکانیش لەپێش هەموو شتێکیترەوە گەورەترینی دەرەبەگەکان بوون، دەبوایە خەرجی بۆ خۆیانو سوپایانو دەستو پێوەندەکانیان ئامادەبکەن، هەندێکیش بۆ دوواڕۆژ تەرخان بکەن، هەندێکیتریش بدەن بە بەغداو کرماشان .

---

(١٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤ .

بۆنموونە عەبدوڕڕەحمان پاشا دە هەزار تمەنی دەدا بــە حکــوومەتی ئێران[17] ، قورسایی ئەو هەموو بارەش بێــگومان لەســەر شــانی جووتیارەکان بوو ، بۆیە دۆخی ئابووری لاواز بوو بەڕادەیێکیوا کــە کەسێــکی وەکوو لازاریف بڵێ ، لە هەموو کوردستاندا مەرکەزێــکی بازرگانی گەورە نەبوو[18] .

شاری سلێمانی کە مەرکەزو پایتەختی میرنشینی بابان بوو ، شارێکی بچووکی هەژار بوو ، تەنانەت لە دوواڕۆژەکانی میرنشینی بابانیشــدا ، بگرە لەدووای ڕووخانی ئەو میرنشینە بە ماوەیێکی زۆریش واتــە لــە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ژمارەی دانیشتووانی لە ١٠٠٠ ماڵ[19] یان زۆر زۆر لە ٢١٤٤ مــاڵ[20] یاخود زۆرتــر لــەوە لە (٦) هــەزار مــاڵ تێنەدەپەڕی[21] .

لە ڕووی ژیانی کۆمەڵایێتی شاری سلێمانییەوە ، سەرەڕای ئــەو کۆمەڵــگا چینایێتییەی باسمانکرد جیاوازی کۆمەڵایێتیش هــەبوو ، عەشایرەکان خۆیان بە گەورەترو بەدەستتر دادەنا لەچاو دانیشتووانی گوندەکاندا ، جووتیارەکانیش ، ئەو جووتیارانەی ڕیچ باســیکردوون ژیانیان لە ژیانی کۆیلەی ئەکرد[22] .

---

(١٧) تاریخ سلیمانیو وولاتی ، ل١٣ .

(١٨) م . س . لازارێف ، کوردستانو مەســەلەی کورد ، مۆســکۆ ، ١٩٦٤ ، « بە زمانی ڕووسی » .

(١٩) سون ، رحلة متنكرة ما بين النهرين و كردستان ، ج١ ، بغداد ، ١٩٧٠ ، ص٢٣٧ .

(٢٠) تاریخ سلیمانیو ولاتی ، ل ٩٠-٩١ .

(٢١) سەرچاوەی پێشوو .

(٢٢) ریچ ، ص ٨٣ .

جــا له دۆخێکی وەها دوواکـەوتووی کۆمەڵایێتیو ئابووری‌دا ، ناوچەیێکی وەها پڕ له شەڕو هەراو ئاژاوە ، سەرمایە ڕووی تێ ناکاو بـە بێ ڕووتێ کردنی سەرمایەیش ژیانی ئابووری نابووژێتـەوە ، هەر لەبـەر ئەمەش بوو گەلێك لەو قافلە دەوڵەمەندو گەورانەی بە کوردســتان‌دا تێ‌دەپەڕین لایان‌نەدەدایە شارێك له شارەکانی کوردستان(٢٣) .

هەر لەبەرئەوانەش دەبینین میرێـکی وەکوو مەحموود پاشا له ساڵی ( ١٨٢٠ )دا بەدڵ حەزی دەکـرد وولاتەکـەی ببووژێنێتـەوەو بـەرەو ڕێ‌یێکی ڕاست ببیات ، بەلام ئەوەی بۆ نەچووەسەر چونکە نه سەرمایەی لەدەست‌دا بوو ، نه سەرمایەش ڕۆوی دەکردە کوردسـتان ، لەبـەرئەو هۆیەی که سەرمایە ڕوودەکاتە شوێنێك دۆخێکی دامەزراوو پڕ له ئاسایشی درێژخایەنی هەبێ(٢٤) ، ئەوەش له کوردستان‌دا بەگشتیو له میرنشینی بابان‌دا بەتایبەتی چنگ نەدەکەوتو نەبوو .

بەلام ئەوانە هەمووی ئەوە ناگەیێنێ کـه ئیتر دۆخی ئابووری لـه جێی خۆی‌دا دەوەستێو پێشکەوتن نابینێ بەخۆیەوە ، بەپێچەوانەوە .. هەر ئەو نیمچە پێشکەوتنە بوو لەدووایین ڕۆژەکانی میرنشینەکـەدا ، بەتایبەتی له سەردەمی عەبدوڕڕەحمان پاشادا تەووژمی هەستی نەتەوایێتی بتر له جاران دەجووڵاند ، خالفین لەمڕووەوە دەڵێ : نەك هەر ڕوخساری نەتەوایێتی بەڵـکوو ئابووریش بوو کە راپەڕینەکانی بەدرخان پاشاو میری ڕەواندزو عەبدوڕڕەحمان پاشای بابانی دەبزواند(٢٥) .

---

(٢٣) لازاریێف ، ل٤ .

(٢٤) نوار ، داود پاشا ، ص٢٨٥ .

(٢٥) خالفین ، ل١٩ .

هەر لەبەر ئەوەشە دەبینین ڕوخساری نەتەوایێتی لە ڕاپەڕینەکانی عەبدوڕڕەحمان پاشادا پتر لە ڕاپەڕینەکانی‌تری میرەکانی پێشووی بابان ئاشکراو بەتەوژمن ، ئەوەندە هەیە ئەو پێشکەوتنە ئابووری‌یە نەگەیشتە ئەو رادەیەی دەستی گۆڕین بەسەر ڕوخساری کۆمەڵگای میرنشینی بابان‌دا بهێنێ‌و ببێتە هۆیێکی ڕاستەقینەو بزوێنەرێکی میرنشینی بابان بەرەو پێشکەوتن‌و سەرکەوتنی تەواو ببا •

هەتا چاو پێداخشاندنێکی سەرپێ‌یش ئەوەمان بۆ دەردەخا کە میرنشینی بابان کەم‌و زۆر بەدرێژایی بوونی •• خاوەنی ڕوخسارێکی نیشتمان‌پەروەریی بووە •

شاری سلێمانی کە ئەمڕۆ ناوجەرگەی بزووتنەوەی نەتەوایێتی‌و ڕۆشنبیری کوردستانە ، بابانەکان دایان‌مەزراندو هەر ئەوان بوون تۆوەکەیان چاند •

میرەکانی بابان شانازی‌یان بە ووڵات‌و نیشتمانی خۆیانەوە ئەکرد • کاتێ خانەپاشا فەرمانی کوشتنی دوو لە سەرۆکە کوردەکانی دەرکرد ، لەبەرئەوەی لە قسەی دەرچوون ووتی : ئەوەی لەگەڵمە ، لەگەڵ نیشتمانە(٢٦) •

کاتێ لە عەبدوڕڕەحمان پاشایان پرسی کە بۆ نابێتە پاشای بەغدا ، ووتی : ڕاستە گەورەتر دەبم ، بەڵام قومێك لە بەفراوی ووڵاتەکەم ناگۆڕمەوە بە هەموو نەرێتی ئیمپراتۆری‌یەتەکە(٢٧) •

---

(٢٦) مێژووی حوکمدارانی بابان ، ل٣٩ •

(٢٧) ریچ ، ل٦٨ •

لە هەموو گرنگ‌تر ئەوەیە کـە ئـەم زمانە ئەدەبی‌یە یەکگرتووەی ئەمڕۆ کورد پێی‌دەنووسێ ، میراتی میرنشینی بابانە ، هەر لە ڕۆژانـی پەیدابوونی ئەم میرنشینەوە ، شێوەی خوارووی زمانـی کوردی بـووە زمانی ڕەسمی میرنشینەکە • بۆ یەکەم‌جار شاعیرانی کورد لە کوردستانی خوارووداو ، بە زاراوی ئەم ناوچەیە هەڵبەستی نیشتمانی‌یان بەسەر گەلی کوردو تێکۆشانی‌و میرنشینی بابان‌و ئامانجەکانی‌دا هـەڵدا ، شان‌بەشانی شیعرە دڵداری‌یێکانیان ، شانازی‌یان بە پاڵەوانانی کوردەوە کردووەو بـۆ ڕووخانی میرنشینی بابان فرمێسکیان ڕشتووە(۲۸) •

عەلی بەردەشانی ، شاعیری میللی ، مێژوونووسـی ڕاپەڕینەکانـی عەبدوڕڕەحمان پاشا بووە بە شیعر ، ئـەم شاعیرە بە شیعرەکـانی باسی ئازایی‌و قارەمانەتیی میرەکانی بابانیشی دەردەبڕی(۲۹) •

لە هەڵبەستەکانی عەلی بەردەشانی‌و نالی‌و سالم‌و کوردی‌دا ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە میرنشینی بابان تا چڕادەیێـك هەسـتی نەتەوایێتـی بزواندووەو بڵاوکردۆتەوە ، نەك هەر لە دڵو دەروونی شـاعیرەکان‌دا بەڵکە لە هەست‌و ناخی میللەتەکەش‌دا ، هەتا ئەمڕۆش میللەتی کـورد شانازی بە دووازدە سوارەی میری بابانەوە دەکا •

شێخ‌ڕەزای تاڵەبانی مەزن ، لە یەکێك لە شیعرە هەرە بەرزەکانی‌دا شانازی بەوەوە دەکا ، کە چۆن سلێمانی کاتێ نشینگەی بابانەکان بوو ،

---

(۲۸) مارف‌خەزنەدار ، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازەوە ، مۆسکو ۱۹٦۷ ، ل ۳٦ « بە زمانی ڕووسی » •

(۲۹) عیزەدین مستەفا ڕەسوول : عەلی‌ی بەردەشانی ، ژیان‌و بەرهەمی ، « گوڤاری کولێجی ئەدەبیات » ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ژمارە (۱٦) ، ل۳۸ •

نه مەحکوومی عەجەمو نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو[٣٠] •

هـــەر لەبەرئەوەشــە دەتوانین بڵێین میرنشینی بابان گـەرچی لە میرنشینەکـــانی‌تری کوردستان گەورەتر نـەبوو ، بەڵام ئـــەو دەورە نیشتمانی‌یەی لە مێژووی گەلی کوردا گێڕای‌و ، ئـەو ئەنجامە گـەورەو میراتە زۆرەی پاشی خۆی بەجێی‌هێشت دەبێتە هۆی ئەوەی بـــە بێ سێودووکردن لەپێش هەموو میرنشینەکانی‌ترەوە دابنرێ •

---

(٣٠) دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، بەغدا ، ١٩٤٦ ، ل ٣٤ ـ ٣٥ •

## سەرچاوەکان


(١) توفیق قەفتان ، مێژووی حوکمدارانی بابان ، بەغدا ، ١٩٦٩ .

(٢) خالفین ن . ئا . خەبات لە ڕێگەی کوردستان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ « بە زمانی ڕووسی » .

(٣) دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، بەغدا ، ١٩٤٦ .

(٤) رسول الكركوكلي ، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء ، بيروت .

(٥) سالح قەفتان ، مێژووی گەلی کورد ، بەغدا ، ١٩٦٩ .

(٦) عبدالعزيز سليمان نوار ، تاريخ العراق الحديث، القاهرة ، ١٩٦٨

(٧) عبدالعزيز سليمان نوار ، داود پاشا والي بغداد ، القاهرة ١٩٦٨ .

(٨) عیزەدین مستەفا ڕەسوول ، گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ژمارە (١٦) .

(٩) كلوديوس جيمس ريچ ، الرحلة ، بغداد ، ١٩٥١ ، ج١ « ترجمة بهاء الدين نوري » .

(١٠) لازاریێف . س . م. کوردستانو مەسەلەی کورد ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ « بە زمانی ڕووسی » .

(١١) لونگریك ، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث .

(١٢) مارف خەزنەدار ، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە . مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(١٣) محمد امين زكي ، تاريخ سليمانیو ولاتی ، بەغدا ، ١٩٣٩ .

(١٤) میجەرسۆن ، رحلة متنكرة ما بين النهرينو كردستان ، بغداد ، ١٩٧٠ ، ج١ ، ترجمة فؤاد جميل .

# ئەوڕەحمان پاشا
# لە تای تەرازوودا

کاتێك ئەوڕەحمان پاشا کاروباری میرنشینی بابانی لە دەورەبەری ساڵی ۱۷۸۹دا گرتەدەست ، هەر بە هۆی ڕاو خواستو ئارەزووی سلێمان پاشای والی بەغدا نەبوو ، بەڵکو ئەتوانین ئەوە بڵێین کە جۆرە خۆسەپاندنێك بوو لەلایەن ئەوڕەحمان پاشاوە ، واتە زۆرەملی تێدا بووە ، ئەمە ئەگەیێنێت کە پتر لەڕێی هێزەوە دەسەڵاتی گرتەدەست . ئەمەش ئەو ڕاستی یە ئەچەسپێنێت کە لە یەکەم ڕۆژەوە ئەوڕەحمان پاشا دڵنیاو پشت بە خۆ ئەستوور بووەو لەئاست والی بەغدادا چاونەترس بووەو ئەمەش هانی داوە هەمیشە چاوی لە ڕزگاربوون لە چنگ دەسەڵاتی والی بەغدا بووبێت ! ئەم ڕاستی یە ئەو ڕێبازەی لێ هەڵقولا کە ئەوڕەحمان پاشا گرتی و بەرەڵای نەکرد . لەوڕوژەشەوە چارەنووسی خۆی بگرە چارەنووسی میرنشینەکەشی نەخشەکردو بناغەی جۆری پەیوەندی لەگەڵ والی بەغاو حاکمی کرمانشاهدا دامەزراند ! .

سەرچاوەی ئەم هێزو دەسەڵاتەش ئەگەڕێتەوە ڕۆژانی پێش ئەوڕەحمان پاشا واتە وەك میراتێك بۆی مابۆوە بەس ئەوەیە لە دەوری

ئەمدا پتر چەسپاو پەرەی سەند ، بەڕادەیەك وای لێ هات ئەوڕەحمان پاشا بە والی دانەری بەغدا دابنرێت(١) . دەسەڵات فراوانی سنوری میرنشینی بابان لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی ئەمدا شێوەو ڕوخسارێکی نوێی وەرگرتبوو تاڕادەیەك لە ڕوخساری هینەکانی پێشووی نەئەکرد ، لەوەی تەنیا میرێکی ناوچەیی بێت و دەسەڵاتی لە چوارچێوەی تەسکی ئەو میرنشینەدا بێت ، ناوەرۆکەکەی لە زەمانی ئەمدا گەلێك لەوە بەماناو فراوانتر بوو ، پتر لەوە ئەچوو وەکو نەوار ئەنووسێت پاشای هەموو کوردستان بێت(٢) .

ئەم هێزو دەسەڵات فراوانییە ئەبوایە لەگەڵ هێزو تواناکانی تری میرنشینەکەدا یەکی بگرتایەوە [ وەکو جۆری هەڵکەوتنی میرنشینەکە ، پیت و بەرەکەتی ئابوریی و زەویوزاری ، هێزی سوپایی مەشق پێکراو..] ئامانجەکانی میرەکان و میرنشینەکە لە سەربەخۆیی و سەرفرازی لە چنگ دەوڵەتی عوسمانی یان هیچ نەبێت لە چنگ والی بەغدا بهاتنایەدی ! کەچی ئەبینین هەر ئەو هۆیانەو چەند هۆیەکی تر کۆئەبوونەوەو یەکیان ئەگرت و چوارچێوەی ئەو هیواو ئامانجانەیان تێك ئەشکان !

لەسەرێکەوە دەوڵەتی عوسمانی نەك هەر دوژمنانە بەڵکو زۆر بە کورت بینی بەرامبەر بە میرنشینە کوردەکان بەتایبەتی میرنشینی بابان ئەجووڵایەوەو سیاسەتێکی هێجگار خوارو خێچی بەکارئەهێنا ، بڕوای بە میرنشینی بابان نەبوو ، هەر لەبەرئەوەی لە ژێرەوە بگرە زۆر جار بەئاشکرا پەیوەندی لەگەڵ ئێران ئەبەست ، نەی ئەتوانی یان نەی ئەویست لەوە بگات کە جۆری هەڵکەوتنی جوغرافیایی میرنشینەکەو زیاتر

---

(١) لۆنگریك ــ ل ٢٣١
(٢) نوار ــ ل ١٢١

بەهۆی سیاسەتی بێباری دەولەتی عوسمانی خۆیەوە میرەکانی بابان ناچار ئەبوون لە ئێران نزیك ببنەوەو دەست بخەنە دەستی یەوەو لەسەر دووپەت یاری بکەن • ئەوە ئاشکرایە لەو ڕۆژانەداهەستی ئاینی یان باشترە بڵێین هەستی مـەزەبپەرستی دەورێـــکی بالای لـە ئێرانی ڕوداوە مێژوویەکاندا ئەدی • جا ئەتوانین لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستی یەدا ئەوە دووبارە بکەینەوە کە ئەگەر بابانی سوننی مەزەب کەمو زۆر باوەڕی بـە دەولەتی عوسمانی هاومەزەبی بوایە ئەوە ئەبووە شوورەیەکی سەختـــی دەولەتی عوسمانی لە کوردستانی خواروودا بەرامبەر بە ئێـــران ، بـــەلام سیاسەتی چەوتی دەولەتی عوسمانی لە خۆیو لە میرنشینی بابانیشــــی تێك‌دا ، نە خۆی توانی سنوورێکی دامەزراوی نەخشەکراو لەم ناوچەیەدا دروست بکاتو نە میرنشینی بابانیش توانی دامەزرێتو گەشەو نەش‌ونما بکات • ئەوەبوو شەڕوشۆڕ لەگەل ئێران هەمیشە بەردەوام بوو،میرنشینی بابانیش لەم پەت بۆ ئـەو پەت ئەچوویاری لەســەر ئەکرد • زوربــەی زۆری سەرچاوەکان لەئاست ئەوڕەحمان پاشادا ناتوانن دان بەو ڕاستی‌یەدا نەنێن کە بەگوێی ئێرانی نەئەکرد ، هەرچەندە جارەهای جار پەنـــای ئەبردە بەر ئێرانو بە یارمەتی ئەو میرنشینی بابانی ئەخستەوە ژێردەست ، بەلام هەمیشە سەرکێشی لەئاست ئێرانو سیاسەتی‌دا ئەکردو لەسەر ئـەو سیاسەتە ئەڕۆیشت کە خۆی ئەیویستو بە ڕاستی ئەزانـــی ، نـــەوار دان بەم‌ڕاستی‌یەدا ئەنێتو ئەنووسێت ئەوڕەحمان پاشا بە قسەی ئێرانی نەئەکرد لەبەرئەوە خۆشیان نەئەویست[٣] • جا دەولەتی عوسمانی نەیتوانی سوود لە پاشایەکی وەکو ئەوڕەحمان پاشا ببینێتو بۆ سوودی هەردوولا بـــەلای خۆی‌دا ڕایکێشێت ، ئەتوانین بڵێین کە دەولەتی عوسمانی بەپێچەوانـــەی ئەمەوە ئەجوولایەوە !

---

(٣) هەمان سەرچاوە ــ ل ٥١

یارمەتیدانی ئێران بۆ میرنشینی بابانو پشتگیری کردنی هەر لـەو سنوورەدا بوو والییەکانی بەغدا لاواز بکاتو دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی لە ناوچەکەدا کز بێتو سەرێشەی لێ نەبڕێتو لە هەمـان کاتیشـدا کوردستان بەگشتیو میرنشینی بابان بەتایبەتی لە گێرمـەو کیشـــەو شەڕوشۆڕی بێوەستانو دۆخێـکی نابووری شـلەقاوی دانەمـــەزراودا بمێنێتەوە ! ڕاستە رووی ئەدا دەولەتی عوسمانیش ئاوڕی لـە میرنشـینی بابان ئەدایەوە بەلام ئەویشـ لەوەدا لەو کردەوەیەیدا لە ئێران نیازپاکتر نەبوو !

بەکورتی هەردوولایان بێوچان هەولیانئەدا ڕێ لە میرنشـینی بابان بگرنو نەیەلن بووژانەوە بەخۆیەوە ببینێتو بگاتە ڕادەیەك پەل بهاوێژێتو ناوچەکانی تری کوردستانی ژێردەستیان بخاتە جوولەو بزووتنەوە واتـــە سیاسەتو بەرژەوەندیان لەو ناوچانە بکەوێتە دەریای مەترسییەوە ! ئەمە بەتایبەتی بەسەر ئەوڕەحمان پاشادا ئەسەپێت، چونکە هەردولایان ، واتە دەولەتی عوسمانیو ئێران لە هیچ میریکی بابان نەئەسلەمینەوە وەکو لەو ئەترسان ، ئەوەش بەزۆری لەبەر ئەوەی ئامانجەکانی ئەوڕەحمان پاشا لە چوارچێوەی میرنشینی باباندا ئۆقرەی نەئەگرتو ئاشکرا دیاربوو هەولی زۆرتری ئەداو هەموو کردەوەو جوولەیەکی لەوەی ئەکرد نەك خۆی هەر بە میـــری میرنشینی بابان دانێت بەلـکو خۆی بـە میراتگری ولاتی کوردەواری دابنێت !

ئەوڕەحمان پاشا وەکو هەموو میرەکانی بابانی پێش خۆی بەبڕواوە سەیری ئێرانو دەولەتی عوسمانی نەئەکرد ، هەتا ئەمەش میراتیـك بـوو بۆی مابۆوە ، ناپاکی سیاسەتی ئەم دوو دەولەتە میرەکانی ئەم میرنشینەی لە ماوەی مێژوویەکی درێژدا فێری ئەم ڕاستییە کردبوو • بەلام ئـــەم

بڕواپێنەکردنە ئەنجامی نەدا ، لەبەرئەوە ئەورەحمان پاشا ڕێگایەکی تازەی گرت بۆ ئەوەی شتێك بێتەدی و دەستکەوتێك پەیدا بکات میرەکانی پێش خۆی ئەوەیان لەدەست نەهاتبێت ! ئەوەبوو هەوڵێکی زۆری دا سەنگێکی قورس و تایبەتی بۆ خۆی و میرنشینەکە دەستبخات و سەربەخۆییەکی گەورەتری دەست کەوێت بەوەی هیچ نەبێت لە چنگ والی بەغدا ڕزگاری بێت و یەکسەر پەیوەندی بە ئەستامبوڵەوە هەبێت ، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە ئامادەیی پیشاندا ساڵانەیەکی گەلێك زورتر بدات(٤) ! بێ گومان ساڵانەی زۆرتر ئەوەی ئەگەیان باری سەرشانی میللەتی هەژار قورس تر بێت چونکە لە گیرفان و ڕەنجی ئەوان ئەو سەرانە زۆرە ئەهاتەدەرێ ، بەڵام بەلای ئەوەوە هێنانەدی ئەم ئامانجە ئەو خۆبەخت کردنەی ئەهێنا ، چونکە ئەمەی دانابوو بە یەکەم هەنگاو بۆ هێنانەدی ئامانجە فراوانەکانی تری !

لەوە دڵنیا بوو کە ئەم هەنگاوە تاڕادەیەکی گەورە لە ڕکیفی ئێران ڕزگاری ئەکات و لە سیاسەتی لەسەر دووپەت یاری کردن دووری ئەخاتەوە ، ئەو سیاسەتەی ـ وەکو لەئەنجامی تاقی کردنەوەیەکی مێژوویی دووروودرێژی باپیرانی یەوە بۆی دەرکەوتبوو ـ میرنشینەکەی لە دواڕۆژدا بەرەو نەمان ئەبرد ، چونکە هەموو جۆرە یارمەتی و پشتگیری کردنێکی ئەم دوو دەوڵەتە بۆ میرنشینی بابان لە پێشی پێشەوە لەبەر چاکەو سوودی خۆیان بوو !.

لەگەڵ ئەوەشا ئەوڕەحمان پاشا هەوڵی دا یەکسەر پەیوەندی بە ئەستامبوڵەوە بێت بەڵام دەوڵەتی عوسمانی هەرگیز قایل نەئەبوو چونکە لەوە دڵنیابوو کە ئەو نیمچە سەربەخۆییەی ئەوڕەحمان پاشا داوای ئەکات

---

(٤) ڕیچ ـ ل ٦٧

له دووارۆژدا ئەكاتە چیو ئەبێتە چی ! كە ئەم جۆرە سیاسەتانە سەری نەئەگرت ئەوسا سیاسەتی شەڕو چەك بەكارهێنان جێگای ئەگرتەوە ، شەڕو هەرای دەوری ئەوڕەحمان پاشاش ئەوەندە زۆر بوو بەڕادەیەك دانیشتنو ئاشتی بەخۆیەوە نەئەدی !

میرەكانی بابان بۆ هێنانەدی ئامانجی سەرفرازی لە جەنگ دەوڵەتی عوسمانی پەنایان ئەبردە بەر برا عەرەبەكانیانو هەوڵیان ئەدا بەرەیەك پێك بهێنن ، ئەوەبوو عوسمان پاشا ( ١٧٨٧ ) لەگەڵ والی بەسرە ڕێك كەوت بەبنیازەی شۆڕشیك بەرپا بكەنو سەربەخۆیی هەردوولایان بهێننەدی(٥) • ئەوڕەحمان پاشاش لەسەر ئەم ڕێو شوێنە ڕۆیشتو ئەم سیاسەتەی گرت ئەوەبوو لە شەڕی كفریدا هەرچەندە سەرنەكەوتو خراپ شكا بەڵام لەڕاستیدا سەركەوتنێكی تری دەست كەوت بەوەی نەك میرە كوردەكان لە هەولێرەوە هەتا دەشتی كركووكو كفری لەتەكیا بوون شەڕیان ئەكرد بەڵكو لەبەرئەوەش شێخی شەمەریش پشتگیری ئەكرد(٦) !

وەكو چون دەوڵەتی عوسمانیو ئێران دووڕوویی و ناپاكییان پیشانی میرنشینی بابان ئەدا ئەمیش بۆئەوەی ئەو نیمچە سەربەخۆییەی بپارێزێت ناچار ئەو سیاسەتەی ئەگرت [ ئەگەرچی لە دووارۆژی دووردا بووە هۆی نەمانی میرنشینەكە ] • جا هەرچەندە ئەم سیاسەتە تاڕادەیەك سەربەخۆیی میرنشینەكەی ئەپاراست بەڵام ئەبووە هۆی شێواندنی هەستی نیشتمانپەروەریتی میرەكانو بگرە هەتا هی میللەتیش [ بەوەی نەیانئەتوانی ڕێبازێكی نیشتمانپەروەری ئاشكرا بگرنو هەمیشە وڵاتیان

---

(٥) لۆنگریك ل ـ ٢٠٢

(٦) دوحة الوزراء ـ ل ٢٥٧

جارێك بۆ ئەملاو جاریکی‌تر بۆ ئەولا دابەش بکەن لەکاتێکدا پێویست‌بوو ئەو هەوڵـە ئاراستەی نیشتمان بکرایە ] • شان‌بەشانی ئـەوەش وڵاتەکە بەگشتی‌و میرنشینەکە بەتایبەتی ئەبووە مەیانی شەڕی بێ‌وەستان‌و زیانێکی گەورەی لە ئابووری میرنشینەکە ئەداو وێران‌و کاولی ئەکرد • ئەوەتا محمد ئاغا دان‌بەم ڕاستی‌یەدا ئەنێت‌و بە ڕیچ ئەڵێت چۆن ئەتوانم زەوی بکێڵم‌و نازانم سەرۆکەکەم تا ساڵێکی‌تر لەجێی خۆی ئەمێنێتەوە یان نا(٧) ئەمەش واتە دواکەوتن‌و وێران‌بوونی ئابوری وڵات ئەبووە کوسپ لـە ڕێی پێشکەوتن‌و گەشەکردنـی میرنشینەکـەداو هێندەی‌تـر هێنانـەدی ئامانجەکـانی لـــە سەربەخۆیی‌و سەرفرازی دوورئەخستەوە ! هـــەر بۆئەوەی بزانین ئەم شەڕو هەرایانە تا چڕادەیەك زیانی ئـــەدا ئەڵێـــن مەحموود پاشا کاتێك شکاو دووایی توانی لێ‌بووردن بۆ خـۆی مسۆگـەر بکات ناچاربوو ٣٠٠ کیسە پارە لەگەڵ بژاردنی هـەموو زیانێـکی ئـەو شەڕە بداتەوە بە دەوڵەتی عوسمانی(٨) • ئەمەش ئەبووە بارێك‌و ئەکەوتە سەرشانی چینی جوتیاران‌و هێندەی‌تـر باری ژیانـی قورسـ ئەکردن ، محمدئاغا دیسانەوە لەم‌ڕووەوە بە ڕیچ ئەڵێت بە هەرجۆرێك‌و بە ناوی هەر شتێکەوە بێت دەیەکی خۆم لە جوتیارەکان ئەسینم(٩) • ئەگەر شەڕوشۆڕی بێ‌پشوو نەبێت چۆن دەشتێکی بەناوبانگ‌و بەپیتی وەکو بازیان وەهـا کاول‌ئەبێت ڕیچ دەربارەی بنووسێت : ڕووت‌و قووت‌و وێـــران لـــە چـــەند کێڵـگەیەك بەولاوە هیچی‌تری تیـــا بەدی‌ناکرێت(١٠) • بەڵام کوشتاری خەڵك‌و خوا ئەوە زیانەکەی لە سنوور بەدەرە ، شەڕەکانی مەغۆلەکان‌و کوشتارەکانیان ئەهێنێتەوە یاد ، هەر بۆنموونە بەســە ئەوە

---

(٧) ڕیچ ـ ل ٦٧

(٨) ڕیچ ـ ل ٤٤

(٩) ڕیچ ـ ل ٦٧

(١٠) ڕیچ ل ٤٤

بلێین که لەپاش شەڕی کفری منارە لــە کاژەســەری کوردەکان دروست کرا(١١) •

ئەگەر ڕووی بدایە بۆ ماوەیەك وڵاتو میللەتەکە هەناسەیەکی بدایەو میرەکانو خەڵکەکە هەوڵیان بدایە دەستێك بە وڵاتەکــەدا بهێنن و ئاهێکی پیابێننەوە ئەوە گورج کاربەدەستانی ئێران ئەهاتنە کایەوەو ئەبوونە ئاگری بن کاو هەرایان دائەگیرسانەوە ، ئاشکرایــە ئەوڕەحمــان پاشــا چاکــەو پیاوەتی‌یەکــی زۆری بەســەر عەبدوڵلا ئاغــای خەزنــەدارەوە هەبــوو لەبەرئەوەی توانی بیکات بە والی بەغدا • [ سلێمان پاشـــای والی بەغـا ڕقی لە عبدوڵلا ئاغای خەزنەداری هەڵئەستێــتو لەگــەڵ تایەر ئاغــای جۆقدار هەردووکیان بە دەستبەسەری ئەنێرێتە بەسرە ! پاش ماوەیەك لێیان ئەبووڕێتو داوای گەڕانەوەیان لێ ئەکات ! بەڵام لە ڕێگا ئەکەونە دوودڵی‌یەوەو ئەترسن لــەوەی والی فێڵیان لێ بــکاتو بیانکوژێت ، لەبەرئەوە ڕائەکەنو خۆیان ئەگەیێننە شاخەکانی کوردستان • لەبەرئەوەی ئەوڕەحمان پاشا کۆنەدۆستیان ئەبێت ، پەنائەبەنە بەر ئەو ـ هەرچەندە والی بەغدا بەمانە ئەزانێت بەڵام زۆر لە ئەوڕەحمان پاشاناکــات دەســتیان لــێ هەڵگرێت•ئەمەش بەڵگەیە کە تاچڕادەیەك پلەی بەرزبووەو والی‌یەکانی بەغا سڵیان لێ کردۆتەوە ـ پاش ئەوەی سلێمان پاشا ئەکوژرێت ئەوڕەحمان پاشا بریار ئەدات عبدوڵلا ئاغا بکاتە والی بەغا ، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجــە بەرەو بەغا ئەکشێو ئەتوانێ بیکات بە والیو دووایی لە ئەستامبوولەوە فەرمانی دامەزراندنی بەتەواوەتی دێت](١٢) لەبەرئەمە عەبدوڵلا پاشا لە قسەی ئەوڕەحمان پاشا دەرنەئەچوو ، ئەمە بە دڵی کاربەدەستانــی ئێران

---

(١١) لۆنگریك ـ ل ٢٣٣
(١٢) دوحة الوزراء ، ل ٢٥١

نەبوو مەترسی ئەوە دایگرتن ئەمە هێندەی‌تر دەسەڵاتی ئەوڕەحمان پاشا بەرەپێ‌بسێنێ تارادەیەك وای‌لێ‌بكات نەك ئێران بەڵكو لە دەوڵەتی عوسمانیش سڵ‌نەكاتەوەو بەمەش دوواڕۆژی سیاسەتی ئێران لە ناوچەكەدا بكەوێتە مەترسی‌یەوە • كردەوەكانی ئەوڕەحمان پاشاش زیاتر ئەم ترسەی ئەچەسپان ، جووڵانەوەو كردەوەكانی ، ئەو سیاسەتەی بەكاری‌ئەهێنا بەتەواوەتی لەوە ئەچوو كە شاعیری میللی ئەوڕۆژانە ( عەلی بەردەشانی) بە شیعر ئەیگێڕێتەوە : نە كاركردن بۆ عوسمانی‌یەكان‌و نە خزمەت‌كردنی ئێران بەڵكو هەوڵدان تەنیا بۆ سوودو خۆشی وڵات‌و میللەت(١٣) • لەبەرئەمە ئێران ماوەیەكی درێژ هەولی‌داو فیتنەی گێڕا هەتا دووایی توانی بەینی ئەوڕەحمان پاشاو عەبدوڵلا پاشای والی بەغدا تێك‌بداو شەڕ بە داگیرسانەوە بدات(١٤) • كاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی‌و نوێنەرەكانی لە بەغدا كردەوەو هەڵوێستیان لە هی ئێران چاكتر نەبوو ، بەلای ئەمانەوە ئەو میرەی تەواو سەری بۆ شۆڕ ئەكردن تا بەجووتە وڵاتیان تاڵان بكردایەو ناوی سەربەخۆیی نەهێنایە ، میرێكی باش بوو ، بەلام ئەو میرەی كەمێك بەتەنگ وڵاتەكەی‌و چاوی لە نەختێك سەربەخۆیی بوایە ئەو میرە بە میرێكی خراپی گێرەشێوێن‌و یاخی‌بوو دائەنراو خێرا سوپای ئەنێررایە سەرو شەڕو هەرا دائەگیرسایەوە،مێژووی سلێمان پاشاو مەحموود پاشاو ئەوڕەحمان پاشا باشترین نموونەن بۆ ئەم ڕاستی‌یە(١٥)• وەنەبێ هەمووكات دەوڵەتی عوسمانی یان نوێنەرەكانیان لە بەغدا ئەمەیان لەدەست هاتبێت واتە بە سوپاو بە چەك سەریان بە میرەكان شۆڕ كردبێت ، ئەگەر بە شەڕ بۆیان نەئەچووە سەر ئەوسا ڕێگایەكی‌تریان ئەگرت كە

---

(١٣) گۆڤاری كۆلێجی ئەدەبیات ، ژمارە ١٦ ، ل ٣٨
(١٤) دوحة الوزراء ـ ل ٢٥٣
(١٥) هەمان سەرچاوە ـ ل ١٥٣ـ١٧٥

بریتی‌بوو له نانه‌وه‌ی دووبه‌ره‌کی له‌نێوان میره‌کانی باباندا ، ئه‌وه‌ش زۆری تێ‌نه‌ئه‌چوو هه‌میشه سه‌ری ئه‌گرت‌و ئامانجی ئه‌هێنایه‌دی .
له‌م‌ڕووه‌وه خالفین ڕایه‌کی نایابی هه‌یه‌و ئه‌ڵێت : « له‌به‌رئه‌وه‌ی حکوومه‌تی عوسمانی‌و ئێرانی ئه‌و هێزه جه‌نگاوه‌ری‌و ئابووری‌یه ته‌واوه‌یان نه‌بوو هه‌تابتوانن له‌ڕێیانه‌وه به‌سه‌ر کورده‌کاندا سه‌رکه‌ون ، له‌به‌رئه‌وه هه‌وڵیان‌ئه‌دا جێ‌پێ‌ی خۆیان له کوردستاندا قایم‌بکه‌ن به‌وه‌ی تۆوی دوژمنایه‌تی له‌نێوان خێڵه‌کاندا بچێنن(١٦) » .

هه‌رچه‌نده ئه‌م ڕاستی‌یه شتێکی تاڵه به‌ڵام به‌ته‌واوه‌تی سه‌ری له بنه‌ماڵه‌ی بابان شێواندبوو هه‌موو کاروکردەوەو ئامانجێکی‌یانی به له‌ناوچوون ئه‌داو هه‌میشه ڕیسه‌که‌ی بۆ ئه‌کردنه‌وه به خوری ! ده‌ردی گرانی ئه‌م بنه‌ماڵه‌یه ئه‌ندامه‌کانی‌و دووبه‌ره‌کی‌و خۆخۆری‌یان بوو ، خۆخۆری ئه‌م بنه‌ماڵه‌یه گه‌یشته ڕاده‌یه‌ك ڕه‌نگه بتوانین ئه‌وه بڵێین که ده‌وڵه‌تی عوسمانی‌و دووایش ئێران له دڵه‌وه‌و به‌ڕاستی له هه‌وڵ‌و ته‌قه‌ڵلای میره‌کانی بابان نه‌ترسابن‌و حیسابی زۆر قوڵیان بۆ نه‌کردبن چونکه هه‌میشه ئه‌یانزانی کام چه‌کی کوشنده دژیان به‌کاربهێنن‌و له چڕێیه‌که‌وه ئاوبکه‌ن به ئاگره‌که‌دا ، دڵنیابوون له‌وه‌ی که زووربه‌ی زۆری بنه‌ماڵه‌ی بابان ئه‌گه‌ر نه‌ڵێین هه‌موویان چاویان له میرنشینه‌که بووه‌و هه‌ریه‌کێکیان ویستوویه‌تی کاربگرێته ده‌ست‌و له‌پێناوی ئه‌وه‌دا ئاماده بووه باوك‌و برا بفرۆشێت‌و پاشقولیان لێ بگرێت. هه‌ر له‌به‌ر هێنانه‌دی ئه‌م سیاسه‌ته نالەبارە بوو که ساڵ ده‌ری دووانزه‌ی مانگی یه‌کێك له که‌س‌وکاری میری بابان له به‌غا یان له کرمانشاه به ده‌ست‌به‌سه‌ری ئه‌ژیا . بۆئه‌وه‌ی هه‌ر که میره‌که‌ی بابان سه‌ری هه‌ڵبڕی خێرا ئه‌وی بکه‌ن به‌گژدا

---

(١٦) خالفین ، ل ٢١

یان لە جێگای ئەوی دابنێن • کارەکە ، یان کارەساتەکە هــەر بەمەوە نەوەستا ، بگرە هەتا ئەوانەش کــە بنەماڵەی بابان بــوونو بەڕێوەبردنی شارەکانیان پێسپێررابوو تەمــاع دای‌ئەگرتنو بۆ کارگرتنە دەست لــە سلێمانی خۆیان ئەکردە داردەستی دەوڵەتی عوسمانی !

لەناو گشت میرەکانی بابان بەدرێژایی مێژووی میرنشینی بابان هیچ میرێك وەکو ئەوڕەحمان پاشا لەم دەردەی نەچێشــت ، ئەمەشــس هــەر لەبەرئەوە نەبوو ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەوڕەحمان پاشا درێــژ بوو یــا لەبەرئەوەی لە هەمووان سەرکێش‌تر بوو بەڵکو بەزۆری لەبەرئــەوە بــوو ئامانجو خواستەکانی ئەوڕەحمان پاشا فراوانتر بوو لە سنووری میرنشــینی بابان واتە دەوڵەتی عوسمانی لە ئەوڕەحمان پاشا ئەسڵەمیەوە،لەبەرئەمەش هەمیشە ئەمو ئەو لە کوڕو براو مامەکانی لــێ ڕاســت ئەکــردەوە هەتا نەیپەرژێتە سەر هێنانەدی هەر پرۆژەیەك یان هەر ئامانجێك لەوەپێشــس دای‌نابێت !

ئاشــکرایە ئەوڕەحمان پاشــا شەش جــار کــاری میرنشینی بابانی گرتەدەست لە ساڵی ۱۷۸۹وە هەتا ۱۸۱۳ ئەوساڵەی تیایا مرد • ئەم‌ماوەیە بەلای کەمەوە شەش جار شەڕی گەورە گەورەی تیا ڕوودا‌وە [ باســی شەڕە بچووکە لاوەکی‌یەکان ناکەین ] • شەڕەکان شەڕی چارەنووسو پاراستنی سەربەخۆیی میرنشینەکە بوون • هەر جار کــە ســەرکێشیو گوێ‌نەگرتنی ئەگەیشتە ڕادەی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بخاتە دوودڵیو ترسەوە ، ســـوپای گــەورەی دەوڵەتی عوسمانی بــەرەو ســـنووری میرنشینی بابان ئەکشا ، هەمووجار زوربەی سەرکردەکانی ئەم سوپایانە خزمو کەس‌وکاری نزیکی ئەوڕەحمان پاشا خۆی بوون ! نەك جارێــك بگرە چەند جار لە دەربەندی بازیان ئەو دەربەندەی شوورەی پاراســتنی

میرنشینی بابان بوو هەر لەو دەربەندەدا وەکو ڕیچ ئەڵێت قایمکاری لــە هەموو شوێنێکی‌دا کرابوو(۱۷) [ ئەوڕەحمان پاشا کردبووی ] هەرچەند هێزی دەوڵەتی عوسمانی دەرەقەت نەئەهـات یەکێـك لە کۆنــە میرە لێخراوەکانی بابان یان مــە خزمــە ناحەزەکانی میری بابان کە شارەزای ناوچەکە بوون ڕێـگای نهێنی پیشانی ســوپای عوسمانی ئـەداو بەوجۆرە لەپشتەوە سوپاو هێزی ئەوڕەحمان پاشا ئابلۆقە ئەدراو کە دەرەقەتیشـــ نەئەهات‌و ئەشکا ناچار ئەبوو خۆی دەرباز بکات(۱۸) •

دەردەکە هێندە گران بوو هەتا میرەکانی بابان خۆیان بەشـــەرم‌و بەداخەوە باسیان ئەکرد ، هەر لەمڕووەوە مەحموود پاشا بە ڕیچ ئەڵێ : « ئامانجی ئێمە بەس بەوە دێتەدی ڕشانەوە بکەوێتە ناو بنەماڵەی بابانەوەو لە یەکێك بەولاوە کەسی‌تریان ڕزگاری نەبێت • نەبنەماڵەکەو نە وڵاتەکە کاری ناچێتەسەر مادەم ئەم هەموو ئەندامە بەهێزانەی تیا بێت »(۱۹) •

ئەوڕەحمان پاشاش وەکو میرێك یان وەکو مرۆڤێـك کـەم‌و زۆر لەڕووی تەواوی یان ناتەواوی‌یەوە دەوری خۆی ئەبینـی‌و ئەودەورەشــ کاری ئەکردە ڕووداوەکانی ئـەو ڕۆژانـەو تاسیریشــی بـۆ دوواڕۆژ بەجێ‌ئەهێشت • گومان لەوەدا نی‌یە کە کردەوەیەکی بچووکـی ناتـەواو لەوانەیە هەوڵ‌و تەقەلای ساڵەهای ساڵانی سەرۆکێك بە ڕووخاندن بدات • بۆ ئەمە ئەڵێین ڕاستە ئەڕەحمان پاشا پیاوێکی ئیجـگار ئازاو چاونەترس بوو هەتا ناحەزەکانیشی دان بەوەدا ئەنێن ، سەرەڕای ئەوەش لەڕووی سیفاتی سەرۆکایەتی‌یەوە وەکـو لۆنگرێـك ئەڵێت هەمـوو سیفاتێـکی

---

(۱۷) ریچ ـ ل ٤٢
(۱۸) امین زەکی مێژووی سلیمانی ـ ل ۱۲٤
(۱۹) ڕیچ ـ ل ۲۲۹

سەرۆکایەتی تیادابوو(٢٠) ، بەڵام شانبەشانی ئەمەش چەند خوورەوشتێکی ناتەواوی هەبوو زیانی نەك هەر لە خۆی بەڵکو لە میرنشینەکەو ئامانجەکانیشی ئەدا ، بۆنموونە ، میرێکی لووتبەرز بوو ، ئەمەش تووشی گێرمەو کێشەی ئەکرد ، هەر لەبەر ئەم لووتبەرزی‌یەی بوو کاتێك یارمەتی عەبدوڵلا ئاغای خەزنەداری داو کردی‌یە والی بەغدا [ وەکو پێشان باسمانکرد ] خۆی لەو بە گەورەترو گرنگ‌تر دائەنا بەرادەیەك بە ئارەزووی خۆی ئەجوولایەوەو گوێی نەئەدایە فەرمانو خواستی عەبدوڵلا پاشا . هەر ئەمەش بوو یارمەتی حاکمی کرمانشاهی دا لەم‌کونەوە ڕێگای خۆی بدۆزیتەوەو بتوانێت دڵی عەبدوڵلا پاشای لێ کرمێ بکاتو دووایی بە شەڕیان بداتو سەرلەنوێ شەڕدابگرسێتەوە . کە دوای ئەمەش بە یارمەتی حاکمی کرمانشاه گەڕایەوە سلێمانی لووتبەرزی گەیشتە ئەو ڕادەیەی هەتا لە دامەزراندنی مووچەخۆریك‌دا بە قسەی حاکمی کرمانشاه نەکات(٢١) . ئەم گوێ‌نەدانە بە دیبلۆماسیەت کە خووی میرەکانی بابان بوو : بووبوە دەردێكو شانبەشانی دەردی لەسەر دووپەت یاری‌کردن ئەڕۆیشت . ئەمانە لەژێرەوە بەنهێنیو بەهێواشی بناغەی میرنشینەکەیان ئەڕووخانو بەرەو نەمانیان ئەبرد !

جگە لەمەش خۆپەرستی لە پلەیەکی بەرزدا بوو ، بۆ نموونە لە شەڕی کفری کە دواشەڕی بوو هەرچەندە ئازایەتی‌یەکی بێ‌هاوتای پیشان‌دا بەڵام کە هاتە سەر شکاندن هەڵهاتو سوپاکەی بێ سەرۆك بەجێ‌هێشتو بەقڕدانی‌دا ، ئەمین زەکی لە ڕووی سوپاییەوە دەستی ڕەخنەی بۆ درێژ

---

(٢٠) لۆنگریك ل ـ ١٧٨

(٢١) دوحة الوزراء ـ ل ٢٥٢ـ٢٥٣

ئەکـات(٢) ، بەڵام تاوانەکـەی لـەڕووی ڕەوشتەوە گەلێـك زیاتـرە ، بەتایبەتی لەو ڕۆژانەدا کـــە کردەوەی وەها بەتاوانو گوناهێکی بێپایان دائەنرا ، ئەگەر هەر میریکی‌تر بوایە لە جێگای ئەوڕەحمان پاشا کـــە ناوبانگی هەموو شوێنێـکی گرتبۆوەو ڕیزێکی تایبەتـی لای میللـــەت هەبوو ، هەریەکێکی‌تر شتی وەهای لێ بوەشایەوە جارێـکی‌تر بۆی‌نەئەکرا بە سەری بەرزەوە لەسەر تەختی میرنشینی بابان دانیشێت‌و ناوی میـری میران لە خۆی بنێت !

جگە لەمانەش میرێـکی قین‌ئەستوور بوو ، بەڕادەیـەك لەوانـەبوو سوودی میرنشینەکەی پێ بخاتە ئەولاوەو بەرچاوی بگرێت‌و هەڵەشـەیی وەهای پێ بکات چارەنووسی خۆی‌و میرنشینەکەی پێ بخاتە مەترسی‌یەوە ، هەر لەبەرئەوەی ڕقی لە محەمەد پاشای کۆیە بوو ، لەگەڵ ئەوەشا کـە محمد پاشا بە دەنگی‌یەوە هات‌و بەخۆی‌و سوپایەوە فریای کەوت کەچی فێڵی لێ کردو هێنایە دەشتی کەرکووك‌و لەوێ پەلاماری‌داو کوشتی . ئەمە نەك هەر لەگەڵ خووڕەوشتی خێڵایەتی‌و کوردایـــەتی بەیەکـــا نەئەلـکان بەڵکو لەوە زیاتر ئەبووە هۆی ئەوەی میرەکانی‌تری کوردستان بڕوایان پێ کەم‌بێتەوەو ئەوەی ڕاستیش بێت ئەوڕەحمان پاشاو میرنشینی بابان لـــەپێش هـــەموو شتێکەوە بۆ هێنانەدی ئامـــانجی سەربەخۆیی ، پێویستی بە بڕواو یارمەتی ئەو میرانەی وڵاتی کوردەواری هەبوو . جگە لەوەی کردەوەی وەها ئەبووە هۆی تێك‌چوونی پەیوەندی لەگەڵ والـی بەغاو هەر ئەوەش زوو هاتەدی ئەوەبوو لەسەر ئەم ڕووداوە شەڕ لەگەڵ بەغا داگیرسایەوەو وڵاتی کوردەواری جارێکی‌تر تووشی دەردو کوشتار بوو(٢٣) .

---

(٢٢) امین زەکی مێژووی سلێمانی ـ ل ١٢٦
(٢٣) گیو موکریانی : حکمدارانی بابان ـ ل ١٤١

پێویسته دان بەوەدا بنێین کە چەند هۆیەکی تریش هەبـوون ئەبوونە کۆسپو ڕێـگای هاتەدی ئامانجەکانی ئەوڕەحمان پاشـایان ئەگـرت • ڕاستە هێزو دەسەڵاتی میرنشینی بابان لە دەورو زەمانی ئەمدا وەکو نەوار ئەڵێت گەیشتە لوتکەی هەرەبەرزی(٢٤) ، بەڵام بۆ چارەڕەشی ئەوڕەحمان پاشاو میرنشینی بابان هەر لەمدەورەدا دەوڵەتـی عوسـمانی خەریکـی خۆکۆکردنەوەو خۆچەسپاندن بوو بێ وەستان زۆر بەگورجی هەوڵیئەدا بناغەی مەرکەزییەت لە ئمپراتۆریەتەکەیدا دامەزرێنێتو لە پەشـێویو لاوازی ڕزگاری بکات • هەر لەمڕۆژانەشدا زوربەی زۆری ئەو والیانەی کاریان لـە بەغـدا ئەگرتە دەست زۆرزانو دووربینو لێهاتو بوونو لە سیاسەتدا قاڵ بووبوون • بەکورتی نەوار وەسفێکی جوانی دەسەڵات لە بەغدا ئەکاتو ئەڵێت « فەرمانڕەوایی والیەکانی بەغدا لە هەرەتی لاوێتیدا بووە »(٢٥) • هەر لەبەرئەمەشە ئەبینین ئەو هەموو هـەوڵو کۆششـەی ئەوڕەحمان پاشا دایوئەو هەموو خۆبەختکردنو ماڵوێرانییە بەدوایدا هات ئەنجامی نەبوو ، بەڵام لە سەرێکیترەوە ئـەو هـەوڵو خەباتـەی ئەوڕەحمان پاشا بووە هاندرێك بۆ نەوەکانی پاش خـۆی ، بـگرە بـووە پاڵپێوەنەرێك بۆ داگیرساندنو تیژبوونی هەسـتی نیشتمانپەروەرێتـیو ڕزگـاربوون لـە چنگ دەوڵـەتی عوسـمانی • [ عـەلی بەردەشانی شـاعیری میللی ئەو ڕۆژانە ، باسی ئەوڕەحمـان پاشاو شەڕەکانی بـە هەڵبەست بڵاوئەکردەوەو هـەستی میللەتی پێ ئەخرۆشـان(٢٦) ] •

ئەوەبوو نەوەکانی هەوڵیانئەدا هەوڵەکانی ئەوڕەحمان پاشا دووبارە

---

(٢٤) نوار ــ ل ١٢٣

(٢٥) هەمان سەرچاوە ــ ل ١٢٢

(٢٦) گۆڤاری کۆلێجی ادبیات ، ژمارە ١٦ ــ ل ٣٨ــ٣٩ ( ووتارێـکی د. عزالدین مصطفی) •

بکـەنەوە ، ڕەنگە هەوڵەکانیان لە سنورو هێزی ئەوەی ئەوڕەحمان پاشادا نەبووبێت ، بەڵام هەوڵەکە هەر هەوڵدان بووەو ئامانجەکە ئەگەر ئـەو کڵپـەیەی نەمابێت بـەڵام ژیلەمۆکەی هەر مابوو . ئـەوەتا ئەدمۆنـدز ئەنووسێت : « گیانی ئەوڕەحمان پاشا هەتا لەپاش مردنیش هـەر مایەوە ، ئەوەبوو پاش مردنی بـە ٣١ساڵ پاشـایەکی تری بابان [ئەحمەد پاشـا ١٨٣٨ – ١٨٤٧ ] سوپایەکی بچـووکی مەشق پێکراوی لـە سوپای ئەوروپایی چووی پێکهێنا(٢٧) .

ئەگەرچی بزووتنەوەکانی ئەوڕەحمان پاشا لەسەر بناغەی میرنشینێکی دەرەبەگایەتی دامەزرابوو بەڵام بە ئامانجو بە ناوەروکی پێشکەوتوو بوو و هەڵگری داخوازی میللەت بوو . لەمڕووەوە خاڵفین ئەنووسـێت « لـە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا کوردەکان بەتیژی بەرهەڵستی سیاسەتـی دەسەڵات دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانیو شایان ئەکرد ، تێئەکۆشان بۆ پاراستنی سەربەستی خۆیان . لە کوردستانی خوارووداا ئەوڕەحمان پاشا ڕاپەرینێکی بەرپاکرد [ ١٨٠٦ – ١٨٠٨ ] ماوەی سێ ساڵ دەوامی کرد ، ئینجا دەوڵەتی عوسمانی بە شەڕەشەقو بـە یارمەتی سەروکـە کوردە خۆفرۆشەکان توانی بەسەریا سەر کەوێت(٢٨) » .

هەر هەوڵو کۆششی ئەوڕەحمان پاشا بوو تەوژمێکی نوێی خستە گیانی میرنشینی بابانەوەو بۆ ماوەیەکی درێژ تاسیرو ناوو بۆنو بـەرامی هەر مایەوەو بوو بە ترووسکەیەك ڕێـگای ڕووناك ئەکردەوە :

ئەدمۆندز دان بەمڕاستی‌یەدا ئەنێتو پاش دەیەها ساڵ کاتێك دێتـە شاری سلێمانی ئەنووسێت :

---

(٢٧) ادموندز ـ ل ٥٥
(٢٨) خالفین ـ ل ٢٠

« هەتا ئەمڕۆش بۆنی دەورو ڕۆژانی ئەوڕەحمان پاشا دێت » .

بەڵام ئەو هەموو تێکۆشانە ئەنجامەکەی داڕزانو نەمانی میرنشینی بابان بوو ، میرەکانی بابان لابرانو مووچەخۆری تورك کەوتە بەڕێوەبردنی پایتەختەکەی کە شاری سلێمانی بوو ، تێکۆشانو ڕاپەڕینی ئاشکرا دژی دەوڵەتی عوسمانی بووە ڕقو کینەو لە دڵو دەروونیدا نیشت ، بە نەمانی میرنشینی بابان هەتا ماوەیەکی درێژ بزووتنەوەی ڕزگاری کورد لەو ناوچەیەدا کپ بوو ، بەڕادەیەك هەتا خێڵێکی دڕی وەك هەمەوەندەکان کە مێژووی بەربەرەکانیانو ناحەزیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دوورو درێژەو ئاشکرایە هەتا ئەوانیش وەکو سۆن ئەڵێت کزبوون(۳۰) .

ئەوڕەحمان پاشا سەرەڕای هەموو ناتەواوی‌یەك ، سەرۆکێکی لێهاتوو بوو وەکو چۆن لە ژیانی‌دا دۆستو دوژمنی ناچار کردبوو ڕێزی لێ بگرن وەهاش ئەو ڕێزە پاش مردنیشی هەر مایەوە ، ئەوەبوو پاش مردنی پیاوە ناودارەکانی کورد داوایان‌کرد یەکێك لە کوڕەکانی [مەحموود پاشا] لەجێی دانیشت ، هەرچەندە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی حەزیان لەمە نەئەکرد بەڵام ناچار دایانئا چونکە ناوی ئەوڕەحمان پاشا زۆر گەورەو بەسام بوو .

---

(۲۹) ادموندز ـ ل ٥٤

(۳۰) سون رحلة متنكر ـ ل ۲۲۲

## سەرچاوەکان


١ ـ رسول الكركوكلي : دوحة الوزراء من تاريخ وقائع بغداد الزوراء ٠ بيـــروت ٠

٢ ـ عبدالعزيز سليمان نوار : داود باشا والي بغداد ـ القاهرة ١٩٦٨ ٠

٣ ـ كلوديوس جيمس ريچ ـ رحلة ريچ ، ترجمة ٠ بهـاء الدين نوري ، بغداد ١٩٥١ ٠

٤ ـ س ٠ هـ ٠ لونگريك : اربعة قرون من تاريخ العـراق الحـــديث ، ترجمة جعفر خياط بغداد ١٩٦٢ ٠

٥ ـ محمد امين زكي : تاريخ سليمانیو ولاتی ، بغداد ١٩٣٩ ٠

٦ ـ الميجر سون : رحلة متنكر ، ترجمة فؤاد جميل ، بغداد ١٩٧٠ ٠

٧ ـ گيو موكرياني : تاريخی حكمدارانی بابان ـ رەواندز ١٩٣١ ٠

٨ ـ عزالدين مصطفى رسول : گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ـ ژمـــارە ١٦ بەغدا ١٩٧٣ ٠

٩ ـ ن ٠ ئا ٠ خالفین ـ خـەبات لە ڕێی کوردستان‌دا مۆسکۆ ١٩٦٣ (بەروسی) ٠

١٠ـ س ٠ ج ٠ ادموندز ـ کورد ، تورکو عەرەب ـ لندن ١٩٥٧ ( بـە ئینگلیزی ) ٠

# میرنشینی پاشای کۆره

## هۆی بەرزبوونەوەو ڕووخانی

هەرچەندە مێژووی میرنشینی سۆران لە ڕەواندز کۆنەو ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی زۆر دوورتر لە ڕۆژانی حوکمدارێتی میر محمدی ڕەواندزی واتە « پاشا کوێر » ، بەڵام قەت ئەو هێزو دەسەڵاتەی بەخۆیەوە نەدیوە کــە لە زەمانی پاشا کوێرە ۱۸۲۰ ــ ۱۸۳٦دا بەخۆیەوە دی • ڕاستە شاری ڕەواندز هەر لە زۆر کۆنەوە ، لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە شارێــکی قایم‌و خاوەن ڕۆشنبیری بووە[1] ، بەڵام لە دەوری پاشا کوێرەدا بووە پایتەختی میرنشینێکی گەورەی بەهێزو ناوبانگێکی گەورەی پەیدا کرد • میرنشینێك دەسەڵات‌و هێزی گەیشتە ڕادەی ئەوەی ببێتە هەڕەشــەو مەترسیــەکی گەورە بۆ میرنشینەکانی دراوسێ‌ی‌و هەردوو دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێران• بۆ چەند ساڵێك وەکو ئەستێرە گەشایەوەو دۆست‌و دوژمن هەزار حسابی بۆ ئەکرد ، کەچی لەپڕ کوژایەوە • بەجۆرێك بووە دیاردەیەکی ســەیر لە مێژووەکەمانا • بەدرێژایی مێژووەکەمان ، میرنشینی کورد هــەبووە ، دەوری لاوازی‌و دەسەڵاتیان بەسەراهاتووەو دیوە ، بەڵام هیچیان وا بــە

---

(۱) ستیفن همسلی لونکریك ، اربعة قرون من تاریخ العراق الحــدیث بغداد ۱۹٦۲ ، ل۷ •

جۆری میرنشینی سۆرانی پاشا کوێرە زوو بەرزنەبووەوەو وەها زووش نەکـەوت •

جا ئەگەر کەمێك ووردبینەوە ، ئەبینین کە چەندهۆیەك ، گەورەو بچوك کۆبوونەوە تا ئەو میرنشینە بەوجـــۆرو شـــێوەیە دامـەزرێت ، هۆیەکانیش ئەمانەن : ـ

بێ گومان جۆری هەڵـکەوتنی ناوچەکـە دەورێـکی بـاڵای لـــە دروستکردنو پەرەسەندنی میرنشینی ڕەواندزی پاشا کوێردا هـەبوو • شوێنەکەی شاخاویو زۆر سەختە ، زوربەی ئەو گەرۆکانـەی بەوێـدا ڕۆشتوون باسیان کردوەو بە یەکێك لە شوێنە هەرە سەختەکانیان داناوە ، جا شوێنێك وەهابێت ، لە دەستدرێژیو پەلامـاردانی هـەموو جـۆرە کاربەدەستانێك چاوی ناترسێتو پشتی بەوە قایمە کە سروشتەکە پارێزگاری ئەکاتو دەستی یارمەتی لە کاتـی تەنـگانەدا بۆ درێـژ ئەکـات ، ئـەو کاربەدەستەی سەرکێشی ئەکاتو پەلاماری ئەدات ئەبێ زیانێکی زۆری لێ بکەوێ • هەر بۆنموونە مولتکە ئەنووسێت کە داگیرکردنی قەڵایەکی بچووکی قەدپاڵی شاخەکانو لووتکەکانی کوردستان « ٣٠ ـ ٤٠ » ڕۆژی ئەوێت(٢) • ئەی بۆ شوێنێکی وەکو ڕەواندز چەندی ئەوێت ؟

جگە لەوەش یەکێك لە ڕێگا هەرە گرنگەکانی کـاروان بـەلای ڕەواندزدا تێئەپەڕی ، ئەمەش لەسەرێـکەوە دەسەڵاتێکی سیاسی ئەدایە ، لە سەرێکی تریشەوە لە ڕێی باجو سەرانەوە سامانێـکی زۆری بۆ ئەهێنا ، لەمانەو لە شتیتر پاشا کوێرە ئەو سامانەی کۆکردەوە کە میلنگن ناوی گەنجی لێ ئەنێتو سوڵتان تەماعی تێکردو بردی بۆ خۆی(٣) • ئـەو

---

(٢) هـ • أ • خالفین ، صراع من اجل کردستان ، موسکو ١٩٦٣ ، ل٤٦

(٣) میجر فریدریك میلنگن، حیاة بدائیة بین الاکراد ، لندن ١٨٧٠ ، ل ٨١٧ •

سامانه بۆ هێنانەدی گەلێك ئامانجی نەتەوەیی یان کەسی ئەتوانرا بەکاربهێنرێت ، ئەو سامانه دەورێکی گەورەی دی هەتا پاشاکوێرە بتوانێت ئەو هەموو تۆپو قەڵاو پردانە دروست بکات .

لاوازی دەوڵەتی عوسمانیش هۆیەکی‌تر بوو بۆئەوەی میری سۆران چاوی نەترسێت‌و دەست بهاوێژێت‌و سنووری میرنشینەکەی فراوان بکات . دەوڵەتی عوسمانی وەها لاوازو ڕسوا بووبوو ، هەتا کوردەکان ــ وەکو فرایزر ئەڵێت ــ حسابیان بۆ نەئەکردو بە یەك سەعات هەولێریان داگیرکرد(٤) . هەر لەم‌ماوەیەدا محمد علی گەورە بووبووە خاوەنی میسرو سوریای داگیرکردبوو هەڕەشەو بەرهەڵستی بەریتانیا نەبووایە هەتا ئەستامبوڵ ئەچوو . لەولاشەوە میرنشینی بۆتانی بەدرخان پاشا پەرەی‌سەندبوو لە گەشەکردنا بوو . جا ئەمانە لاوازیەکەی دەوڵەتی عوسمانیان دووقات ئەکرد ، تا وای لێهات استعماری بەریتانیا ناچار داوا لە والی بەغدا بکات یارمەتی میری سۆران بدات ، تا دەوڵەتی عوسمانی بتوانێت لەڕووی محمد علی‌دا بوەستێت(٥) .

دۆخی سیاسی ناوەوی ئەو ڕۆژانەش یارمەتی دەرێکی‌تر بوو بۆ ئەوەی میرنشینی سۆران وەها زووبەزوو تەشەنە بکات . ئەوەبوو میرنشینی بابان کە بەهێزو دەسەڵات‌ترین میرنشینە کوردەکان بوو تەواو لاواز بووبوو بەڕادەیەك میرەکەی پێی نەکرابوو میوانداریتی میوانێکی وەکو فرایزەری گەڕۆك بکات(٦) . لەبەرئەوە بەلای دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە شتێکی ناخۆش

---

(٤) جیمس بیلی فریزر ، رحلة فریزر الی بغداد ١٨٣٤ ، بغداد ١٩٦٤ ، ل٢٠ .

(٥) د. عبدالعزیز سلیمان نوار، داود پاشا ، القاهرة ١٩٦٨ ، ل١٠٣

(٦) فریزر ، ل ٢٠ .

نەبوو هێزێکی‌تر دروست بێت شوێنی بابانەکان پڕبکاتەوەو ببێتە دیوارێـک لە ڕووی ئێراندا ، ئەمە وای‌کرد دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتادا چاو لە دەست‌درێژی‌و تەشەنەی دەسەڵاتی میری سۆران بپۆشێت • کە هەستیشی بەوە کرد بووەتە مەترسی‌یەکی گەورەو کاتێك دەسەڵاتی پەیداکردەوە ، ئەوسا لێی ڕاست‌بووەوەو دەستی لێ وەشاند •

هەروەها شەخسیەتی پاشـا کوێرەی میری سۆرانیشـــ دەورێـکی ئێجگار بالای هەبوو لـە پێگەیشتن‌و پەرەسەندنی میرنشینی سۆراندا ، بەڵگەش ئەگەر هیچمان پێ نەبێت ، بەسە ئەوە بڵێین کە پێش پاشا کوێرە دەسەڵات‌و هێزی ڕەواندز قەت نەگەیشتە ئەو ڕادەیەی کە لە ڕۆژانـی پاشاکوێرەدا هەیبوو ، خۆ پاش ئەویش میرنشینەکەی سـۆران تـەواو کوێر بووەوە • هەر لە منالی‌یەوە ڕقی ئەوەی لە دڵدا کۆبووبۆوە کـــە ئەیدی چۆن دووبەرەکی‌و تەڵە بۆ یەکنانـــەوەی مـام‌و خزمەکانـــی میرنشینەکەی بەرەو داڕزان ئەبرد ، ئەمە تەواو کـاری تێ‌کـرد[٧] ، کارتێ‌کردنێك هەر لە منالی‌یەوە چاوی لەوەوە بێت ڕۆژێك لە ڕۆژان کار بگرێتە دەست‌و سەربەخۆو دەست بەرەڵلا بێت تا بە ئارەزووی خـۆی باری میرنشینە لەق‌بووەکە ڕاست بکاتەوەو بیچەسپێنێت•هەر ئەم هەستەش لە دڵ‌و دەرونیا بووە دڵ‌ڕەقی ، دڵ‌ڕەقی‌یەك بەکاری‌ئەهێنا نەك هەر وەك ڕێـگایەك ببیات بەرەو هێنانەدی ئامانج‌و خواسـتەکانـی ، بەڵـکو لای بووە خوو هەرچەندە زۆر کاری بۆ ئاسان کردو لغاوی سەرکێش‌تریـن خێڵە کوردەکانی پێ کرد[٨]و میرنشینەکەی بەخێرایی‌و لە ماوەیەکـی کورت‌دا چەسپان‌و سنووری فراوان کرد ، بەڵام لە دواڕۆژدا بۆی بووە

---

(٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣١ •

(٨) علاء الدين سجادی ، شۆڕشەکانی کورد ، بەغدا ، ١٩٥٩ ، ل ٦٤

مایەی زیان • دڵڕەقی یەکەی لە لایەك ، دادپەروەری یە سەرزاری یەکەش لە لایەکی ترەوە ، ناوبانگێکی ئەوتۆی بۆ هێنا ، هەتا میری سۆران بێتە ئەفسانە،کۆبوونەوەی ئەم دوو سفەتە واتە وەکو میلنگن ئەڵێ داگیرکەرو یاسادانەر(۹) لە میری سۆراندا،یارمەتی دا لەو ماوە کورتەدا ئەو میرنشینە بەهێزو فراوانە دروست بکات • بەو دڵرەقی یەی وای کرد دزو جەردە لە وولاتەکەدا نەمێنێ ، زەبرو زەنگی گەیشتە ڕادەیەك هەتا بێگانەکان بە بێ پرسینەوە نەیان ئەوێرا پێ بخەنە سنووری میرنشینەکەوە • ئەمن و ئاسایشی میرنشینی سۆران بوو بە نموونەو لەسەر هەموو زبانێك بوو ، ئەوترا ئەگەر جاران ئەوەی هێلکەیەکی بەدەستەوە بووایە ئەکوژرا ، بەڵام لە ڕۆژانی پاشا کوێرەدا دەستی پڕ لە زێڕ نەئەترسا(۱۰) • بێ گومان ئەمە یارمەتی ئەدا دۆخی ناوەوەی میرنشینەکە بەگشتی بووژێتەوەو کار بکاتە سەر خووڕەوشتی دانیشتوانو ، بەڕادەیەك گەلێك لە گەڕۆکەکان هەستیان بەوە کردووەو دانیان بەوەدا ناوە کە هەر پێ بخرایە سنووری میرنشینەکەوە ، ئەوە هەست بە جیاوازی خووڕەوشتی خەڵکەکە ئەکرا • ئەمە ئەوەندەی تر میرنشینەکەی ئەچەسپان و یارمەتی فراوانبوونی ئەدا •

جا ئەم دۆخەی وەها لەپڕ بۆ میری سۆران هاتەدی بێدەنگی دەوڵەتی عوسمانی،هەست بە هێز کردن و لە خۆ بایی بوون ، هانی میری سۆرانی دا بەوەوە نەوەستێت و هێندەی تر پەل بهاوێژێت •

ئەمانە هەمووی لە لایەك ، لە لایەکی تریشەوە ئەو هێزە سوپایی یەی هەیبوو ، لەوەی نەئەکرد هی میرنشینێکی بچووك بێت بەڵکو زیاتر لەوەی ئەکرد هی نیمچە دەوڵەتێك بێت نیازی گەورەبوونی هەبێت • سوپاکەی

---

(۹) میلنگن ، ل ۹ •
(۱۰) سەرچاوەی پێشوو ، ل ۱۸۵ •

زۆر بەهێزو بەزەبت بوو ، هەر ژمارەی یاساوڵە تایبەتی یەکانی خۆی ٣ هەزار کەس بوون(١١) • لەمەش زیاتر هیچ میرنشینێك نە لەپێش پاشای کوێرەداو نە لەپاش ئەو بەوجۆرە چەکی قورس واتە توپی بەکارنەهێناوە ، یەکەم جار بوو ، تۆپ بەو ژمارە زۆرە بەکاربێت ،بگرەکارگەی تۆپ‌و جبەخانە دروست‌کردنی لە شاری رەواندز دامەزراند ، جا گومان نی‌یە کە ئەمە هەیبەتێکی تەواوی دایەو ترسی خستە دڵی دراوسێ‌یەکانی‌یەوەو یارمەتی‌دا بەئاسانی لەشەرەکانی‌دا سەرکەوێت‌و سنووری میرنشینەکەی فراوان بکات •

دۆخی سیاسی دەرەوەی ئەورۆژەش پاڵی ئەنا بە میری سۆرانەوە پێشکەوێت‌و وەها خێرا بێتە سەر شانۆی رووداوەکان‌و میرنشینی سۆران پێ‌بگات • ئاشکرایە هەر لە زۆر کۆنەوە دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێران لەسەر دەست بەسەرا گرتنی میرنشینە کوردەکان لە شەڕو هەرادا بوون ، کە هیلاکیش ئەبوون‌و لە شەڕکردن ئەکەوتن ، ئەوسا لە ڕێی میرنشینە کوردەکانەوە ئەچوون بەگژیەکداو پیلانەکانی خۆیان ئەهێنایە دی • لەو ڕۆژانەدا دەوڵەتی عوسمانی لاواز بوو ، بەڵام کەوتبووە سەر سەودای ئەوەی مەرکەزیەت بچەسپێنێ • بەڵام هەتا ئەورۆژە هات ئەم نیازە بهێنێتە دی ، بەناچاری چاوی لە تەشەنەکردنی میرنشینی سۆران ئەپۆشی • هەر لەوڕۆژانەدا داود پاشا والی بەغدا بوو ، لە دڵەوە ڕقی لە بابانەکان بوو ، ئەیویست‌و هەوڵیشی ئەدا لە ناویان‌بەرێت ، چونکە قەت میرنشینێکی کوردی وەك میرنشینی بابان نەبووە ، بووبێتە مایەی سەرێشەو مەترسی بۆ دوڵەتی عوسمانی‌و والی‌یەکانی بەغدا ، جا بەلای داود پاشاوە شتێکی باش بوو میرنشینی رەواندز لەسەر حیسابی بابان گەورە بێت • کە بابانەکانیش

---

(١١) فریزر ، ل ١٢ •

بەرەوازە بوون دەستی ئێران بەمە شکا ،جا هەتا ئێرانیش پێیخۆش بوو سۆران بێتە کایەوە بەمەرجێ لەژێر ڕکێفی خۆیدا بێتو لەئاست دەولەتی عوسمانی قوتیبکاتەوە ، بەتایبەتی ئێران خۆشی لەماوەیەدا بەشەڕی ڕووسەوە سەرقاڵ بووو ئەگەر بیشیویستایە بۆی نەئەکرا ئاوڕلە میرنشینی ڕەواندزو پەرەسەندنی بداتەوە(١٢) .

جا ئەم دۆخە سوودێکی بێهاوتای بوو بۆ میری سۆرانو هانیدا بە هەر چوار لادا پەل بهاوێژێتو لە کەس سڵنەکاتەوە بەلگەش ئەوەیە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا ، میری سۆران ئەمو ئەو میرنشینی داگیر ئەکرد ، کەچی ڕووی نەدا دەولەتی عوسمانی یان ئێران یاخود والی بەغدا هەڕەشەی لێبکەن یان چاوێکی سووری پیشان بدەن .

دوواشت ئەوەیە کە میرنشینەکانی دەوروپشتی لە دۆخێکی لاوازی داڕزاودا بوون بەهۆی نەخۆشییە کۆنەکەی میرنشینەکانی کورد ، واتە دەردی دووبەرەکیو فیتنەبازیو تەلە بۆ یەك نانەوەو یەکتری خواردنەوە . لەکاتێكدا پاشا کوێرە خەریکی ئەوەبوو بە دەستێکی ڕەق ئەو نەخۆشییانە لە میرنشینەکەیدا لەناوبەرێت ، یەکە یەکە میرنشینە دراوسێیەکانی داگیرکرد . گەورەترین دەستکەوت داگیرکردنی میرنشینی ئامێدی بوو . بەمە ناوبانگێکی تەواوی بۆ خۆی پەیداکرد ، چاوی گەلێك میری تری ترساند ، چونکە ئامێدی زۆر سەخت بوو ، داگیرکردنی وەها ئاسان نەبوو ، جگە لەوەی ناوچەیەکی گەلێك دەولەمەند بوو . ئەوی ڕاستیبێ میری سۆران بە داگیرکردنی ئامێدی چەند پلەیەك بەرزبۆوە . نموونەیەکی تریش ، جاران دەسەلاتی میری بابان تادەشتی حەریری بندەستی ڕەواندز گەیشتبوو ، بەلام لە زەمانی پاشای

(١٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١ .

کوێرەدا دەسەڵاتی ڕەواندز گەیشتە ڕانیەی بن‌هەنگڵی بابان • بەم‌جۆرە ، لە ئەنجامی ئەم هۆیانەدا ، پاشای ڕەواندز ، توانی میرنشینی سـۆران بەوجۆرەی ئەیویست دامەزرێنێت • هەر لە سـەرەتاوە هـەوڵی‌دا ، دامەزراندنەکە لەسەر شێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بێت •

پاشا کۆرە هەر لـە منـاڵی‌یەوە خولیای سەربەخۆیی لە سەردا بوو(١٣) ، سەربەخۆیی ئامانجی هەرە گەورەی بوو ، زوربەی گەڕۆکو مێژووناسەکان دانیـان بەمەدا ناوە ، سۆن لەم‌رووەوە ئـەڵێت « ئەمیش وەکو ئەو [ واتە پاشای کوێرەش وەکو ئەوڕەحمـان پاشـای بابان ] چاوی لە سەربەستی‌و سەرفرازی میللەتەکـەیەوە بـوو(١٤) • سەربەخۆیەك لەگەڵ سنووری ئاواتە گەورەکانی یەك بگرنەوە • دوور نی‌یە لاوازی‌و بێ‌دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێران وای لێ کردبێت چاو ببڕێتە ئەوەی ببێتە هاوشـانیان ، کردەوەکانیشـی ئەمـەی دووپات ئەکردەوە • لاسایی ئەوانی ئەکردەوەو لافی ئەوانیشی لێ ئەدا • قـەڵا دروست‌کردن‌و سکە لێدان‌و کردنەوەی کارگەی چەك‌و جبەخانە(١٥) ، دانانی پایـەو سـیفاتی دادپەرووری بـە خـۆ دان‌و بەستنی پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ محەمەد عەلی‌ی میسردا کە گـەورەترین دوژمنی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، ئەمانە ، لە ڕاستی‌دا ، دەری‌ئەخـەن کە میری سۆران خەیاڵی زۆر دوور ڕۆیشتوە ، بەتایبەتی دەوڵـەتی عوسـمانی

---

(١٣) صالح قەفتان ، مێژووی نەتەوەی کورد لە کۆنەوەتا ئەمڕۆ ، بەغدا ١٩٦٩ ، ل ٢٩٨ •

(١٤) ی٠ب٠سون ، رحلة تنكرية في ميسوپوتاميا وكردستان ، لنـدن ١٩١٢ ، ل ٣٧١ •

(١٥) حسين حزني موكرياني ، موجز تاريخ امراء سوران ، ترجمـة : محمد الملا عبدالكريم ، بغداد ١٩٦٧ ، ل ٣٩ •

له باتی هەڕەشەو سزادان هـات ڕوتبەی میری میرانی پێ بەخشیو[16] ئێرانیش دانـی بەسـەربەخۆیی میرنشینەکەیدانا[17] ، وەکو میرنشینێك نەك وەکو دەوڵەتێك چونکـە دەوڵەتـی فارســ ئەگەرچـی حەزی بـە زیانو نوشوستی دەوڵەتی عوسمانی ئەکرد بەڵام ڕازی نەئەبوو ئەوەشــ لە خۆی بقەومێت •

سنووری میرنشینەکە لە ماوەیەکی کەمدا زۆر فراوان بوو • ئامێدی ، زاخو ، ئاکرێ ، کۆیە ، ڕانیە ، هەولێری گرتەوە ، لەولاشەوە گەیشتە جزیرەو ماردینو لەملاشەوە گەیشتە پردێ ( ئاڵتون کۆپری )[18] ، هەرچەندە سۆن ئەڵێ کـە سنووری گەیشتە نزیك کــەرکوك[19] • بەخۆڕاییش پەلاماری (زەنگار) سنجاری داو خەڵکێکی زۆری کوشت • ئەوی ڕاستی بێت ، هەرچەندە دڵڕەقی لە داگیرکردنی ئـەم ناوچانـەدا بەکارئەهات ، بەڵام بە دەستێکی ئاسنین دابینیکـردو بەجۆرێك وەکـو لۆنگریك ئەڵێت ڕێكخستنو زەبتکردنی وەهایان قــەت بەخۆیانــەوە نەدیبوو[20] •

سـاڵی ١٨٣٦ سـاڵی ڕمــانو ڕووخــانی کتوپڕی میرنشینە بەشەوکەتەکەی سۆران بوو • کورتە سەرنجێك بۆمان دەرئەخات بۆچـی وەها ڕووخا ؟

---

(١٦) محمــد امين زەكی ، خلاصــة تاريخ الـكرد وكردستان ، القاهرة ١٩٣٩ ، ل ٢٢٩ •

(١٧) حسين حزنی ، ل٣٩ •

(١٨) يو٠ر٠های ، سنتان في كردستان ، لندن ١٩٢١ ، ل١٩١ •

(١٩) سون ، ل٣٧٢ •

(٢٠) لونگريك ، ل٢٨٩ •

دەوڵەتی عوسمانی بە هەموو هێزێکی‌یەوە هەوڵی‌ئەدا تەوقـــی هەڕەشەو مەترسی میسری محەمەدعەلی گەورە لە مل خۆی داماڵێـت • سیاسەتی جیهانی ئەوڕۆژەش واتە بەریتانیا کە دەوری گەورەی ئەدی ، لەگەڵ سیاسەت‌و خواستی دەوڵەتی عوسمانی‌دا یەکی‌ئەگرتەوە • دەوڵەتە ئیمپریالیستی‌یەکان دەستیان خستبووە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە ، لەژێر پەردەی پاراستنی کەمایەتی‌یە ئاینی‌یەکاندا ئەم دەست‌تێ‌خستنەیان ئەشاردەوە • بەریتانیا نەی‌ئەویست دەوڵەتـی عوســـمانی لـەوە زیاتـر لاوازبێت ، لەبەرئەوە چۆن دژی محەمەد عەلی‌ی میسر وەستا وەهاشــ دژی میری سۆران ڕاوەستا ، هانی دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانی ئەدا پەلاماری سۆران بدەن • کە کێشەکەی میسر تەواوبوو ئەوسا دەوڵەتـی عوســمانی دەستی بەتاڵ بوو هەموو هێزی ئاراستەی میرنشینی سۆران کرد • بۆ ئەم نیازە هەر بەوەوە نەوەستا هێزێکی تایبەتی خۆی لە ئەســـتەمبووڵەوە بـــە سەرکردایەتی ڕەشید پاشا بنێرێت ، بەڵـکو داوای لـە والـی بەغـداو مووسڵ‌کرد ئەوانیش بەشداری ئەو گەمارۆدانە بکەن •

ئێران لووتی لەوە ئەخورا سوود لەم دووبەرکی‌یــە وەربگــرێ‌و جێ‌پێ‌ی خۆی لە ڕەواندز قایم بکات ، بەڵام هــەر لەم‌کاتــە ئاڵـۆزو ووردەدا ،میری سۆران ، ئەوەی بە هەل زانی عوسمانی‌یەکان خەریکی خۆکۆکردنەوە بوون ، لەم‌ماوەیەدا لەجیاتی ئەوەی پەلامـاری بـدات ، پەلاماری چەند ناوچەیەکی ئێرانی دا(٢١) • ئەم کورت‌بینی‌یــەی میری سۆران وای‌کرد ئێران تەواو دڵی لێ پیــس بکـات‌و بچێتە ســەر ڕاو داخوازی بەریتانیاو ڕازی بێت بەیەکەوە لەگەڵ دەوڵەتـی عوســمانی‌دا پەلاماری میری سۆران بدەن ، بەوەی باش بوو دەوڵەتی عوسمانی کــە

(٢١) خالفین ، ل٤٧ •

له هەموو جۆرە تەدەخولێکی ئێران ئەسڵەمیەوە لە کوردستاندا قایل نەبوو دەست بخاتە دەستی ئێرانەوە[22] • میری سۆران کورت بینیەکەی هێندەی تر تۆخ کرد بەوەی دووبەرەکی مەزهەبی خستە نێوانەوە ، واتە نەی ئەویست پەتی سیاسەت بگرێت و سوود لە دووبەرەکیی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران ببینێ ، هەر لەبەرئەوەی ئێران شیعە مەزەب و دەوڵەتی عوسمانی وەکو خۆی سونی مەزەب بوو[23] • هەرچۆنێك بێت دەوڵەتی ئێران قەت دەروون و سیاسەتێکی پاکی بەرامبەر میرنشینی ڕەواندز نەبوو • وەکو جەلیلی جاسم باسی ئەکات پێش ئەوەی بەریتانیا بتوانێت ئێران و دەوڵەتی عوسمانی ڕێك بخات ئێران خێرا نزیکەی ١٠ هەزار چەکداری ناردە سەر کوردەکان[24] • هەتا ڕوسیاش لەم ڕووداوانەوە دوورەپەرێز نەوەستاو دەستێکی لە دەستی تورکیاو بەریتانیاو دەستەکەی تریشی لە دەستی ئێراندا بوو و لەوڕووەوە یارمەتیدا[25] • لەناوچوونی هێزەکەی محەمەدعەلی میسری ، واتە کشانەوەی لە سوریا ، زیانێکی گەورەی بۆ میری سۆران هێنا • میری سۆران پێوەندی لەگەڵیا هەبوو ، ئیبراهیم پاشای سەرکردەی لەشکری محەمەد عەلی لە میسر چەك و جبەخانەی ئەنارد بۆ میری سۆران ، سوپاکەسی بەگۆشتی مەڕی کوردستان ئەژیا[26] •

هۆیەکی تریش بووە کۆسپ لەڕێگای میرنشینی سۆراندا ئەویش

---

(٢٢) د· عبدالعزيز سليمان نوار ، تاريخ العراق الحديث ، القاهرة ١٩٦٨ ، ل١٠٥ •

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو •

(٢٤) جەلیلی جاسم ، کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی نیوەی یەکەمی سەدەی نوزدەهەم ( بە ڕووسی ) مۆسکۆ ١٩٧٣ ، ل١٠٠ •

(٢٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل١١٠ •

(٢٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٧ •

کۆمەڵگای کوردی ئەوڕۆژە بوو ، ئاشکرایە کۆمەڵگای ئەوڕۆژانەی کورد خێڵەکی دەرەبەگایەتی بوو • هەموو میرنشینێك خۆی بە سەربەخۆ دائەناو بگرە مافی میرنشینەکەی وەکو دەمەلوجی ئەڵێت بە مافێکی پارێزراو دائەنا(٢٧) ، جا کە میرێکی کورد بهاتایە میرنشینێکی‌تری داگیر بکردایە بەوە هەستی خێڵایەتی ئەورووژا ، خۆ ئەگەر لەو داگیرکردنەدا دڵڕەقی بەکاربهاتایە ئەوە خوێن ئەکەوتە ناوەوەو تۆوی دوژمنایەتی‌و تۆڵەسەندن ئەچێنرا • جا هەڵەی گەورەی میری سۆران هەر داگیرکردنی میرنشینەکانی دوەروپشتی نەبوو ، بەڵکو ئەو دڵڕەقی‌یە زۆرەش بوو کە بەکاری ئەهێنا • لە شەڕی ئامێدی‌دا خێڵێکی هەر لەبەرئەوە قڕکرد کە ئازایانە بەرهەڵستیان کرد(٢٨) •

لەناو دڵڕەقی‌و زەبرو زەنگی میری سۆران ، ئەم ناوچانە بەناچاری سەریان شۆڕ کرد ، بگرە بە نابەدڵی بەشداری شەڕەکانیشیان ئەکرد ، بەڵام هەمیشە چاوەڕوانی تۆڵەسەندن بوون ، کە ئەو ڕۆژەش هاتە پێشێ‌و دەوڵەتی عوسمانی پەلاماری میری سۆرانی دا ، خێرا پشتیان کردە میری سۆران • هەستی نیشتمانپەروەریش ئەوەندە بەهێز نەبوو تا ئەوەیان پیشان‌بدات کە نوشوستی میری سۆران‌و سەرکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی زیانی میللەتەکەو دواڕۆژی نیشتمانەکەی تێدایە •

بەرزفڕی‌یەکەی میری سۆران ئەوەندە بەهێز بوو ، لەوە ئەچوو چاوی بەرایی نەدا ، میرێکی‌تری ناودار لەتەك ئەودا هەبێت • ئەمە بەرەو ڕێگای ناڕاست‌و کردەوەی چەوت ئەیبرد ، ئەگینا لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ میرنشینێکی گەورەی بەهێزی وەکو میرنشینی بۆتانی بەدرخانی‌یەکان

---

(٢٧) صديق الدملوجي ، امارة بهدينان ، الموصل ١٩٥٢ ، ل٤٧ •
(٢٨) فريزر ، ل٢٦ •

ڕێک کەوێت ، ئەو میرنشینەی خەریکی خۆ کۆ کردنەوە بوو بەنیازی نانەوەی شۆڕشێکی گەورە دژی دەوڵەتی عوسمانی ، لەجیاتی ئەمە پەلاماری بۆتانی‌داو ویستی موڵکەکانی زەوت بکات • بەوە دڵی بەدرخانی‌یەکانی لە خۆی ڕەنجان‌و دۆستێکی بێ‌هاوتای لەکیس خۆی دا • هەروەها سیفەتی دڵڕەقی میری سۆران بە زیان بۆی شکایەوە ، ڕاستە ئەو دڵڕەقی‌یە لە سەرەتادا چاوی زۆری ترسان‌و ئەرزی بۆ تەخت کرد میرنشینەکەی بچەسپێنێ‌و خێرا سنوورەکەی فراوان بکات ، بەڵام واشی کرد خەڵکی لێ‌ی بترسن‌و خۆشیان نەوێت • پەلاماردانەکەی بۆسەر ژەنگار ( سنجار )و کوشتنی هەزارەها کەس‌و بەدیل گرتنی سەدەها منداڵ‌و ئافرەت(۲۹) ، ئەمە لە ناوزڕاندن بەولاوە هیچی‌تری بۆ نەهێنا •

ئەگەر ئاوڕێك لە کردەوەکانی میری سۆران بدەین‌و بزانین چی بۆ میللەت کرد ، ئەبینین ئەوەش هۆیەکی‌تری نوشوستی میری سۆران بوو • ڕاستە وولاتەکەی پڕ کرد لە قەڵا ، پردێکی زۆری لەسەر ڕووبارەکان دروست کرد ( کە بۆهاتوچۆی سوپاکانی بوو ) ، بەڵام قوتابخانە ، مزگەوتێك ، حوجرەیەکی نەکردەوە • ئەو هەموو شەڕو شۆڕانەش ئەیکردن زیانێکی زۆری بۆ میللەتەکە هێناو بێزاری کرد • میللەتەکە خۆی لەخۆیا ڕەش‌وڕووت بوو ، ئەو شەڕانەو ڕاگرتنی سوپایەکی گەورەی وەکو سوپاکەی میری سۆران میللەتەکەی خستبووە ژێر بارو ئەرکێکی گرانەوە ، خەرجی ئەو سوپایە لە گیرفانی میللەت ئەهاتەدەرێ،هەموو شەو سەد تا دووسەد سەرەك عەشرەت لە دیواخانەکەیا نانیان ئەخوارد ، بە دوو قیمەت چەك‌و جبەخانەی ئەکڕی(۳۰) • هەرچی

---

(۲۹) صدیق الدملوجی ، ل٤٥ •
(۳۰) محمد امین زکی ، تاریخ الدول والامارات الکردیة ، القاهرة ١٩٤٥ ، ل٤١١ •

خەرجی‌یەکی ئاسان بوایە لە گیرفانی خۆی ئەیدا ، بەلام خەرجی‌یە گەورەکان وەکو مووچەی هەموو ئەو سەربازو ئەفسەرانە ، قەلاو پرد دروستکردن لە باجو سەرانەی میللەتەوە بوو(٣١) . زوربەی گەڕۆکەکان لەوە ئەدوێن کە میللەتەکە رەش‌وڕووت بووە . ڕۆس ئەنووسێت : « میللەتەکە هەژارو نەخوێندەواربوو ، دەولەمەندەکانیش وەکو دەولەمەندەکانی بەغدا خۆیان ئەگۆڕی(٣٢) .

کورت‌بینی میری سۆران لە سیاسەتدا هۆیەکی‌تری ئەو لەناوچوونە خێرایەی بوو ، ئەگەرچی ئازاو بەزەبرو زەنگ بوو ، بەلام لە سیاسەتدا کورت‌بین بوو بەڕادەیەك بڕوای بە بەلێنی بەریتانیاو دەولەتی عوسمانی دوژمنی کردو خۆی دا بەدەستەوە . هەر ئەوەندەی هەستی کرد زروف بۆ ئەو نی‌یە سەری لێ‌تێك‌چوو وازی‌هێنا ، نەك وەك سەرۆکێکی خاوەن ئامانج بەلکو وەکو یەکێك لە ڕەعیەتەکانی سولتان چاوەڕوانی لێ‌بووردن‌و بەخشندەیی سولتان بێت . ئەگینا هەرچەندە ئاینی بوو بەڕادەیەك هەلپەرکێی ڕەشبەلەکی قەدەغەکردو ئاین هەمیشە دەورێکی بالای لە ژیانیا ئەدی ، بەلام ئەو هۆیانەی باسمان کردن دەوریان گەلێك لە ئاین بەهێزتر بوو بۆ خستنی میرنشینی سۆران . ڕێ‌ی‌تێ‌ناچێ میرنشینێکی وەها بەهێزو دەسەلات بە فتوای مەلایەك وەها زوو بڕمێت ، چونکە ئەوی ڕاستی بێت میری سۆران ، کاتێك دەولەتی عوسمانی پەلاماری‌دا ، خۆی بڕیاری شەڕوەستاندن‌و خۆ بەدەستەوەدانی دا . بەلگەش ئەوەیە ئەحمەد بەگی برای بڕیاری بەرهەلستی دابوو و بۆئەمەش داوای لە سوپاکە کرد کە کێ شەڕی ناوێ لابداتە لای کاکی ( میری سۆران )و مەلای

---

(٣١) حسین حزنی ، ل٦٠ .

(٣٢) محمد امین زەکی ، تاریخ الدول والامارات الکردیة ، ل٤٠٨ .

خەنێ ( خاوەنی فتواکە ) ، ئەوەی شەڕیشی ئەوێت لابداتە لای ئـەو ، لەئەنجامدا لە چەند کەسێك بەولاوە کەسـی‌تر لای نەدایـە لای میـری سۆرانو زوربەی سوپاکە بە ئەفسەرو سەربازەوە لایان‌دایە لای ئەحمەد بەگ[٣٣] • میژووی میرنشینەکانی کورد ، دەری‌ئەخـات ئەوەنـدەی میرنشین بووە ، ئەوەندش ڕاپەڕین بووە • بابانەکان جارەهای جار دژی دەوڵەتی عوسمانی هەستاون ، بەڵام ڕووی‌نەداوە ئەو ڕاپەڕینانە بە فتوایەك لەناوبچن • هەر پاش پاشای کوێرە ،دوو راپەڕینی گەورەی کورد ، لە میرنشینی بۆتانو دوایی لە شەمزینان ڕووی‌داو دەوڵەتی عوسمانی‌یـان هێنایە لەرزین ، هەردوکیان کوژێنرانەوە ، بەڵام بە فتوا نا •

هەرچۆنێك بێت قەڵاکانی میری سۆران ، لە مێـژووی کـوردا ، نیشانەن کە ئەو میرە ڕۆژێك لەڕۆژان هەوڵی سەرفرازی داوە •

---

(٣٣) حسین حزنی ، ل٦٦ـ٦٧ •

## سەرچاوەکان :


١ ـ محمد امين زەكی ، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان ، القاهرة ١٩٣٩

٢ ـ محمد امين زەكی ، تاريخ الدول والامارات الكردية ، القاهرة ١٩٤٥

٣ ـ د٠ عبدالعزيز سليمان نوار ، داود پاشا ، القاهرة ١٩٦٨ ٠

٤ ـ د٠ عبـدالعزيز سليمـان نوار ، تاريخ العـراق الحديث ، القاهرة ١٩٦٨ ٠

٥ ـ ستيفن همسلي لونكريك ، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ، ترجمة جعفر خياط ، بغداد ١٩٦٢ ٠

٦ ـ صديق الدملوجي ، امارة بهدينان ، الموصل ١٩٥٢ ٠

٧ ـ جيمس بيلی فريزر ، رحلة فريزر الى بغداد ١٨٣٤ ، بغداد ١٩٦٤ ٠

٨ ـ علاء الدين سجادی ، شۆڕشەکانی کورد ، بەغدا ١٩٥٩ ٠

٩ ـ صالح قفطان ، مێژووی نەتەوەی کورد لە کۆنەوەتا ئەمرۆ ، بەغـدا ١٩٦٩ ٠

١٠ـ حسين حزنی المكريانی ، موجز تاريخ امراء سوران ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، بغداد ١٩٦٧ ٠

١١ـ يو٠ر٠های ، سنتان في كردستان ، لندن ١٩٢١ (باللغة الانكليزية)

١٢ـ ی٠ب٠سون ، رحلة تنكرية في ميسوبوتاميا وكردستان ، لنـدن ١٩١٢ ، باللغة الانكليزية ٠

١٣ـ ميجر فريدريك ميلنگن ، حياة بدائية بين الاكراد ، لندن ١٨٧٠ ، باللغة الانكليزية ٠

١٤ـ هـ٠أ٠خالفين ، صراع من اجل كردستان ، موسكو ١٩٦٣ باللغـة الروسية ٠

١٥ـ جليلی جاسم ، اكراد الدولة العثمانية في النصف الاول مـن القرن التاسع عشر ، موسكو ١٩٧٣ (باللغة الروسية) ٠

# لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزووتنەوەی
# بەدرخان پاشـــا
# ١٨٤٣ ـ ١٨٤٧

لەوڕۆژانەدا کە بزووتنەوەکەی بەدرخان پاشا بەرپا بوو ، کوردستان لەنێوان دوو ئیمپراتۆریەتی چاوبرسیدا دابەش کرابوو ، ئیمپراتۆریەتی فارس و عوسمانی • هەردوولایان لەمێژەوە لەسەر دابەش کردنی کوردستان لە مشتومڕو شەڕو هەرادا بوون • کوردستان بۆ هەردوولایان نەوەکـو هەر وولاتێکی شاخاوی و خاوەنی ستراتیجییەتێکی گرنگ بوو ، بەڵکو وولاتێکی بەپیتو خاوەنی میللەتێکی ئازاو شەڕکەریش بوو •

هەردوو ئیمپراتۆریەتەکە بۆئەوەی میللەتی کـورد یەكنـەگرێ ، هەمیشە کنەیان دەکردو میرنشین و دەرەبەگە کوردەکانیان دەکرد بەگـژ یەکدا ، هەوڵیاندەدا میللەتی کورد وەکو چۆن پارچە پارچـەو دابەشـ کراوە بەچەند میرنشینی دەرەبەگی ، هەروەهاش بمێنێتەوەو لاوازتـــر بکرێن و دوژمنایەتیی ناوخۆ لەکەڵـکیان بخات تا قووتدانیان ئاسانتر بێ و نەیەڵن یەكبگرن و لەڕوویەکێك یا هەردوو ئیمپراتۆریەتەکەدا بوەستن • یەکێتیی گەلی کوردو پەیدابوونی کوردستانێکی یەکگرتوو نەوەکو هەر کوردستانی لەکیس دەدان بەڵکو هێزێکی سێیەمیشی بۆ دروست دەکردن

که ڕاستەوخۆ هەڕەشەی لە پەرژەوەندی‌یە سیاسی‌و ئابووری‌و سوپایی‌یەکانیان دەکردو دوواڕۆژیانی دەخستە مەترسی‌یەوە .

هەر لە ساڵی ١٥١٦وە بە پیلانی سوڵتان سەلیم‌و هەوڵ‌و کۆششی مەلا ئیدریسی بتلیسی زوربەی کوردەکان‌و میرنشینەکانی کورد لایان‌دایە لای دەوڵەتی عوسمانی .سوڵتانی عوسمانی ناوبراو بەڵێنی‌دا کە ئەو میرنشینە دەرەبەگی‌یانەی کورد سەربەخۆ بن‌و پشتاوپشت بۆ نەوەکانیان بمێنێتەوە ، بەمەرجێك سەرانەو باجێکی ساڵانەی کەم بدەن ، بەڵام لەکاتی پێویستا سەرباز بنێرن بۆ سوپای دەوڵەتی عوسمانی.بەم جۆرە بزووتنەوەی ڕزگاری‌خوازی کوردو میللەتی کورد لەباتی ئەوەی بەرەو یەکێتی‌و یەك‌گرتن بچن بەرەو دابەش‌بوون‌و داپچڕان چوون ، ئەمەش ئەنجامێکی باشی نەدا ، ڕەنگە ئەنجامەکەی باش بووایە ئەگەر یەکێك لەو میرنشینانە بەهۆی هێزو دەسەڵاتی تایبەتی‌ی خۆیەوە بیتوانیایە میرنشینەکانی‌تری کوردستان داگیربکاو بیخانە ژێر دەسەڵاتی خۆی‌و ، بەوجۆرە یەکێتی‌ی کوردو یەکگرتنی کوردستانی بهێنایەتەدی ، وەکو چۆن لە دوواڕۆژێکی دوورا هەر بۆ نموونە ئیتالی‌یایی‌یەکان‌و ئەڵەمانەکان هێنایانەدی ، بەڵام ئەمە ڕووی‌نەدا ، چونکە نیازو مەبەسی سوڵتان سەلیم‌و هەموو سوڵتانەکانی دووای ئەو بریتی‌بوو لە لەناوبردن‌و قووت‌دانی میرنشینەکان ، جا یا لە ڕێی هێزو سوپای دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە ڕاستەوخۆ ، یاخود لەڕێی ئەوەوە کە دووبەرەکی‌و شەڕو هەرا لەنێوان میرنشینەکانی کوردا داگیرسێنێ‌و هەردوولایان لاواز بکاو دووایی هەردووکیان قووت‌بدا .

لە ساڵی ١٨٢٨دا سوڵتان مەحموودی دووەم ویستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ببووژێنێتەوەو بەرگێکی نوێی بەبەرابکاو مەرکەزیەت

بچەسپێنێ • لەمساڵەدا لەئەنجامی ئەو سیاسەتەی بەرامبەر بە میرنشینەکانی کورد بەکاردەهات ژمارەی ئەو میرنشینانە تەواو کزبووبوو ، تەنیا چەند میرنشینی مابوونەوە کە هەرە گەورەو گرنگەکانیان میرنشینێ باباڹو سۆراڹو بۆتان بوو ، بە سەرۆکایەتی بەدرخان پاشا(۱) •

بەدرخان پاشا هەستی بە مەترسی ئەو سیاسەتە کردبوو ، لەبەرئەوە هەر لە ساڵی ۱۸۲۱ەوە ( محەمەد ئەمین زەکی‌هاتنی لە ساڵی ۱۸۲۱دا دادەنێت ، بەڵام لە لاپەرەیێکی‌تردا دەڵێ ئەو ساڵە ڕاست نی‌یە(۲) ) کە کاروباری میرنشینەکەی گرتە دەست ، کەوتە خۆی •

سوڵتان مەحموود ، بۆ هێنانەدی ئامانجەکەی هەوڵی‌دا مەرکەزیەت بچەسپێنێ ، بۆ ئەمە پەلاماری میرنشینە کوردەکانی دا ، سەرۆکە کوردەکانی لابردو تورکی لەجێ‌یان دانا • جا ئەگەر دەوڵەتی عوسمانی ئەم کارەی پەسند کردبێ‌و بە شتێکی باشی دانابێ ، بەڵام ئەم حوکمی ئەفەندی‌یانەو سوپاکانیان بەلای جوتیارو گاوانەکانەوەو بۆ دەسەڵاتی میرەکانی بۆتاڹو بادینان شتێکی باش نەبوو(۳) • ئەمە هەستی ناڕەزایی لای میرو دەرەبەگەکان ، وە لای خەڵکی ووڵات وورووژاند • میرەکان لەبەرئەوەی ئەو مافانەیان لێ سەندرایەوە ، کە پشتاوپشت بۆیان

---

(۱) بۆ زانیاری‌تر لەمبابەتەوە ، سەیری ڕۆژنامەی «کوردستان ۱۸۹۸ – ۱۹۰۲» ژمارە (۸) ، (۹) ، (۱۱) ، (۱۳) ، (۱٤) بکە • کۆکردنەوەو پێشەکی‌ی دوکتۆر کەمال فوئاد ، بەغدا ، ۱۹۷۲ •

(۲) محمد امین زەکی ، خلاصة تاریخ الکرد وکردستان ، القاهرة ، ۱۹۳۹ ، ص ۲۵۰ – ۲۵۲ «ترجمه من الکردیة الی العربیة محمد علي عوني» •

(۳) س•هـ•لونگریك ، اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث ، ط۳ ، بغداد ، ۱۹٦۲ ، ص۸۸۷ « ترجمه من الانکلیزیة الی العربیة جعفر خیاط » •

مابووەوە ، وە بەمە لە بەرژەوەندیو هەستی نەتەوایەتی‌یان درا ، میللەتیش لەبەرئەوەی لەئەنجامی ئەم کارەدا ڕاستەوخۆ کەوتە بەردەم دەسەڵاتی تورکە دڵڕەقەکانو باری سەرشانی هێندەی‌تر قورس بوو • جاران لەژێر دەستی میرەکانی خۆیاندا بوون کە پێوەندی‌ی عەشیرەتی بەیەکەوە دەیبەستنو بە یەك زمان دەدوان ، بەڵام ئێستە کەوتنە ژێردەستی تورکێکی بێگانەوە ، دڵڕەقانە دەیچەوساندنەوە ، باجو سەرانەیێکی بێ‌ژماری خستبوە سەریان ، ئەمانیش بەرژەوەندی‌یان کەوتە مەترسی‌یەوە ، وە هەستی نەتەوایەتی‌یان وورووژا •

سوڵتان مەحموود هەر بەمەوە نەوەستا ، دەیویست سوپایێکی بەهێزیش دروستبکا ، وە بۆ ئەم مەبەستە کەوتە سەربازگرتن لە کوردەکان ، ئەمانە دۆخەکە یان ئەوەندەی‌تر وورووژاندو بەرەو تەقانیان بردو هۆیێکی گەورە بوون بۆ ڕاپەڕینەکەی بەدرخان پاشا • مینۆرسکی دەنووسی : داگیرکردنی کوردستان بەمجۆرە نوێیە ، هۆیێك بوو بۆئەوەی بۆ یەکەمجار ڕاپەڕینێکی نەتەوەیی بە سەرۆکایەتی بەدرخان بتەقێتەوە لەساڵی ١٨٤٣ - ١٨٤٦دا[٤] •

سیاسەتەکەی سوڵتان مەحموود بۆ چەسپاندنی مەرکەزیەت هەر بۆئەوە نەبوو دەوڵەتی عوسمانی ببووژێنێتەوەو بیباتەوە دۆخی جارانی ، بەڵکو بۆ لەناوبردنی میرنشینەکانی کوردیش بوو ، هەر لەبەرئەمەش ئەم سیاسەتە بۆ میرە کوردەکان ناوەرۆکێکی نەتەوایەتی وەرگرت ، لە لەبەرئەوەی ڕوخساری کوردایەتی لەو میرنشینە کوردانەدا

---

(٤) ف•ف• مینورسکی ، الاکراد ـملاحظات وانطباعات ، بغداد ، ١٩٦٨ ، ص٢٦ « ترجمه من الروسیة الی العربیة وکتب مقدمته وعلق علیه الدکتور معروف خزنەدار » •

کۆبووبووەوە • بوونی ئەم میرنشینانە ، ئەوهەستە نیشتمانپەروەری‌یەی کەوتبووە جم‌وجۆڵ لەناو میرە کوردەکان‌و دەستەو تاقمە هوشیارەکانی کورد ، ئەو قین‌و داخەی لەناو دڵ‌و دەروونی چینـی زەحمەتکێشـ‌و جووتیارەکانا دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕەگی داکوتابوو ، ئەمانە هەمووی هەڕەشەیێکی گەورەی بۆ دەوڵەتی‌عوسمانی دروست کردبوو ، لابردن‌و نەمانی ئەو میرنشینانەو سەر بە کورد شۆڕکـردنی کـردبووە کارێـکی پێویست •

هەر لەم سەردەمەو لەم ساڵانە‌ی‌دا هێزێکی‌تر لە دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی ، وە لە کوردستانا بەتایبەتی چالاکانەسەری دەرهێنابوو ، ئەویش گورج‌و گوڵی ئینگلیزە ئەمپریالیستەکان بوو •ڕووسیای قەیسـەری زۆر لەمێژەوە دەوری لە کوردستان‌دا دەدی ، وە کنەی لە دەوڵەتی عوسـمانیا دەکرد • بەڵام لـــە سـەرەتای سـەدەی نۆزدەمەوە ، کوردستان بووە مەیدانی زۆرانبازی‌یێکی سەخت لەنێوان ڕووسیاو بەریتانیاو دووابەدوواشیانا ئەمەریکا ، پێش ئەوەی بەدرخان پاشا دەست بە بزووتنەوەکەی بکا ، بـە چەندەها ساڵ بەریتانیا دەستی خسـتبوە کوردسـتانەوە ،میسـیۆنێرەکانی ( بعثة دينية ) لەژێر پەردەی بڵاوکردنەوەی ئایینی دیانی‌دا ، گەڕۆکـە مەدەنی‌و سوپایی‌یەکانی بە ناوی گەڕان‌و پشکنینەوە بە هەر چوار قوڕنەی کوردستانا گەڕابوون ، نەخشەی کوردستان‌و عەشرەتەکانیان کێشابوو ، گرنگیەتی کوردستانیان چی لە ڕووی ئابـووری ، وە چـی لـە ڕووی سوپایی‌و ستراتیجی‌یەوە بۆ ئاشکرا بووبوو • ئیمپریالیزمی بەریتانیا وەکو ڕووسیای قەیسەری بوونی ئاسووری‌و ئەرمەن‌و کلدانی‌یان لە کوردستانا بەتایبەتی کردبووە داردەست بەنیازی جێ پێ قایم‌کردنـی خۆیان لـــە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌داو لووت خستنە ناو کاروباری ناوەوەی • لـە زۆر شوێنی‌کوردستان‌دا لەناو ئەو کەمە نەتەوەیی‌و ئایینیانەدا قوتابخانەیان

کردبووەوە ، نەك بەنیازی ئەوەی میللەتێـکی دوواکەوتـوو لـە ڕووی خوێندەواری‌یەوە پێش‌بخەن ، بەڵکو بۆ چاکەو سوودو ستراتیجی‌یـەتی دوڵەتەکانیان بوو(٥) •

سیاسەتی قەبەو ناقۆڵاو کۆنەپەرستو ڕەگەزپەرستی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبـەر بـەو کەمایەتی‌یـە نەتەوەیـی‌و ئایینیانـەو پرۆپاگەندەی ئایینی ئیمپریالیستەکان لە ڕێی میسیۆنێرەکـانیانەوە وای کردبوو ئەوانـە ڕووبکەنـە ئیمپریالیسـتەکانو چـاویان لـە یارمەتـی‌و پاراستنیانەوە بێ ، جا ئیمپریالیستەکان کە هەمیشە چاویان لەو ڕۆژەوە بـوو ئیمپراتۆری‌یەتە نەخۆشەکەی عوسمانی بەلادابێ‌و لاکەکەی لەناو خۆیان‌دا دابەش‌بکەن ، ڕازی نەدەبوون ، بەتایبەتی بەریتانیا کە لەم وولاتـە لاوازو بێ‌هێزەدا بزووتنەوەیێکی ڕێکوپێك‌و خاوەنی ئامانجێکی نیشـتمانی ڕەوان پەیدا ببێ ، لە بەشێکی هەرە گرنگی‌ئەو ئیمپراتۆری‌یەتە واتە لە کوردستان لە ناوچەی بۆتان دامودەزگایێکی بەهێزو نوێی تێدا دامەزرێ‌و ڕستەکەی ئەو بکاتەوە بە خوری • لەبەرئەمە پەیدابوونی میرێکی نیشتمان‌پەروەری وەکو بەدرخان پاشا کە چاوی نەك هەر لە سەربەخۆیی میرنشینەکەیەوە بوو ، بەڵکو ئامانجی دەوڵەتێکی کوردستانی سەربەخۆ بوو(٦) فراوانتـر لە کوردستانی عوسمانی •

پەیدابوونی میرێکی واو خاوەنی ئامانجی وا لەگەڵ ئامانج‌و مەبەسی ئیمپریالیستەکانا ڕێـك‌نەدەکـەوت • لێـرەدا دەوڵەتـی عوسـمانی‌و

---

(٥) م•س•لازارێڤ ، کوردستانو مەسەلەی کورد ، مۆسـکۆ ، ١٩٦٤ ، ل٤٤ «بە زمانی ڕووسی» • (بۆ زیاتر زانین دەربارەی ئەم میسیۆنێرانە سەیری «لازارێڤ ل٤٤ـ٤٧» بکە ) •

(٦) شاکر خصباك ، المسألة الکردیة ، بغداد ، ١٩٥٩ ، ص٢٥ •

ئیمپریالیستەکان دژی بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد بە سەرۆکایەتی بەدرخان پاشای میری بۆتان یەکیان دەگرتەوە •

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٤٣دا ئەو زرووفە سیاسی یەی کوردستانی تێدابوو ، وای دەکرد کە بزووتنەوەی رزگاری ی کورد لە بۆتان کۆبێتەوەو بتەقێتەوە لەبەرئەوەی بەهێزترین و گەورەترین میرنشینی ئەوسای کورد بوو ، لەبەرئەوەش سەرۆکێکی ئازاو هوشیاری نیشتمانپەروەری بۆ دروست بووبوو ، لەبەرئەوەش میرنشینە بەهێزەکانی تر وەکو میرنشینی ڕەواندزی پاشا کۆرە ماوەیێك لەوەپێش بە دەستی دەوڵەتی عوسمانی لەناوچووبوو ، میرنشینی بابانیش تەواو لاواز بووبوو ، جا هەر ئەم زرووفانەش وای کرد دەوڵەتی عوسمانی هەموو هێزو توانای خۆی ئاراستەی میرنشینی بۆتان و بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد لەوێ بکا •

فراوانی بزووتنەوەکە ، ڕووداوەکانی ، ئامانجە نیشتمانی یەکانی ، دەستتێخستنی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان ، ئەمانە هەموو بوونە هۆی ئەوەی بزووتنەوەکە لە چوارچێوەی کوردستانی عوسمانی وەکو ڕووداوێکی ناوخۆ دەربچی و بچێتە چوارچێوەیێکی جیهانی یەوە • ئەمەش یەکەمجارە لە مێژووی کوردا ، مەسەلەی کوردو بزووتنەوە رزگاری خوازەکەی قەوارەیێکی جیهانی وەربگرێ •

بەدرخان پاشا لە ساڵی ١٨٢١دا کاری میرنشینی بۆتانی گرتەدەست ، هەموولایێك تەنانەت ناحەزەکانیشی دانیان بە هوشیاری و دووربینی و نیشتمانپەروەریەتی یا ناوە • هەر لەوڕۆژەوە کەوتە کارو بەکارهێنانی تاکتیکێکی تایبەتی ، بە سوودبینین لە لاوازی دەوڵەتی عوسمانی بۆ خۆکۆکردنەوەو بەرەبەرە رزگاربوون لە جنگی • لەم کارەیدا

دووربینی‌یێکی پیشان‌دا بەدەگمەن لەناو سەرۆکە کوردەکانـی‌ترا بووە •
هەستی نیشتمانی وای لێ نەکرد پەلە بکاو بە سەرگـەرمی‌و هەڵەشـەیی
ئامانجە دوورو نزیکەکانی بە لەناوبردن بدا • ئامانجـی کوردسـتانێکی
سەربەخۆی دانا • بۆ هێنانەدیشـی بناغەیێـکی قایمـی داڕشـت ، واتـە
بزووتنەوەی رزگاری‌خوازی‌کوردی لـە شێوەیێـکی عەفەوی‌دەرهێنـا ،
دووربینی‌یەکەی وای‌لێ‌کرد هەست بەوە بکـا کـە میللەتـی کـورد بـۆ
ڕزگاربوون‌و سەرفرازی پیویستی بە دوو شتی گرنگ هەیە ، یەکەمیان ،
یەکگرتنی هۆزە کوردەکان لەسەر ڕێ‌وشوێن‌و لە بـەر رووناکـی بیـرو
باوەڕێکی ڕوونی دیارکراو کە سەربەخۆیی کوردستان بوو ، دووەمیان ،
دانانی دامودەزگایێکی دروست‌کردنی چەك‌و جبەخانە ، وە پشت‌بەستن
تەنیا بە کوردو هێزو تواناى تایبەتی خۆی ، ئەمە جـگە لە ئاوڕدانەوەی
ڕاستەقینە لە دۆخی زەحمەت‌کێشان‌و کەمە نەتەوەیـی‌و ئایینـی‌یەکانـی
کوردستان • لەئەنجامی تاقی کردنەوەو مێژووی گەلی کوردەوە ئـەو
ڕاستی‌یانەی بۆ ئاشکرا بوو • مێژووی گەلی کورد کە هەمیشـە بریتـی
بوو لەوەی هۆزەکانی بە هاندانی ئەم دەوڵەت‌و ئەو دەوڵـەت خەریکـی
یەکتر خواردن‌و بوونە سەربازو داردەستی ئەم‌و ئەو ، وە بۆ نیازی سوودو
چاکەی لای‌تر خوێنی یەکتر ڕژاندن بوون •

بڕواکردن بە هەر دەوڵەتێك‌و پشت‌بێ‌بەستنی کارێك بوو بەئاشکرا
دەرکـەوتبوو کـە هەموو دەوڵەتەکان بۆ سـوودو بەرژەوەندی خۆیان
ئامادەبوون لە هەموو کاتێك‌دا کورد بفرۆشن‌و پشتی تێ‌بکەن • لەبەرئەمە
کۆششێکی زۆری کرد بۆ دانانی کارگەی چەك‌و جبەخانە • بە زۆر بـە
خوایشت کەوتە یەکخستن‌و ڕێکخستنی سەرەك عەشیرەت‌و میرە کوردەکان
لەژێر سایەو دەسەڵاتی خۆی‌دا ، پیاوی دەنارده لای هەمـوو سـەرۆكێك‌و
داوای یەك‌گرتنی لـێ دەکردن ، وە سەرفرازی کوردستانی بۆ کردن بـە

دروشم ، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەسە « پەیمانی پیرۆزی » لەنێوان سەرۆکە کوردەکانا بەست • پەیمانەکەی بە پیرۆز ناوبرد چونکە ئامانجەکەی کە سەرفرازی کوردستان بوو ئامانجێکی پیرۆز بوو(٧) •

میللەتی کورد لەو سەردەمەدا لەدەوری دەرەبەگیدا بوو ، دەرەبەگیش وەکو چینێك بەرژەوەندی خۆی دەخاتە سەرووی بەرژەوەندی میللەتو نیشتمانەوە بە ووشەو دروشمی پیرۆز نابزوێ ، بۆ ئەمجۆرە دەرەبەگو سەرۆکانە چاوترساندنو هەڕەشەی بەکارهێنا • جا ئەم هەڕەشانە لەلایێك ، وە سیاسەتە پڕ لە مەترسی‌یەکەی دەوڵەتی عوسمانیش لەلایەك ، وای‌کرد ئەمانەش لابدەنە لای بەدرخان ، بەمجۆرە ژمارەیێکی زۆر لە سەرۆکە کوردەکان لەدەوری کۆبوونەوە • هەر بۆنموونە وەکو میر نوروڵلای هەکاریو خان مەحموودی مەکس کە دوو میری زۆر گەورە بوون • ئەوەی گرنگ بێ ئەوەیە هەر سەرۆکەکانی کوردستانی عوسمانی نەبوون هاتنە ناو پەیمانی پیرۆزەوە ، بەڵکو میری ئەردەڵانی کوردستانی ئێرانیش هاتە ناویەوە • هاتنی میری ئەردەلان هەر مانای بەهێزبوونو فراوانی سنووری بزووتنەوەکەی نەدەدا ، بەڵکو ناوەرۆکێکی نوێی نەتەوایەتیشی پێ بەخشی ، بەوەی کە کوردستان یەك خاکەو میللەتی کوردیش یەك میللەتەو خاوەنی یەك ئامانجە ، جا با دابەشو پارچە پارچەش بێ • ئەمە گیانێکی نوێی کرد بە بەری بزووتنەوەی‌رزگاری‌خوازی گەلی کوردا ، وە تا ڕادەیێکی زۆر لە چوارچێوەی ناوچەیی‌و ئامانجی دەرەبەگایەتی دەری‌هێنا • پرۆپاگەندەکردنیش بۆ بزووتنەوەکەو ووشیار کردنەوەی میللەت تەووژمێکی نوێی پێ‌بەخشی •

---

(٧) بۆ زانیاری‌ی‌تر لەم‌بابەتەوە ، سەیری «بلەچ شێرکۆ ، القضیة الکردیة ، القاهرة ، ١٩٣٠ ، ص٤٠-٤٢»بکە •

هیچ بزووتنەوەیێك ناچێتە نـاو دڵو دەروونـی میللەتـەوە ئەگـەر ناوەرۆکێکی کۆمەلایەتیو ئابووریشی نەبێ ، لەمڕووەشـەوە بەدرخـان کەمتەرخەمی نەکرد ، بەپێی توانا زەوی بەسەر جووتیارەکـانا دابەش دەکرد ، باجو سەرانەی سەرشانیانی کەمکردەوە ە هـەر لەبەرئەمەشـ بوو لـە زۆر ناوچەکانی کوردستانەوە خەڵکی دەهاتن بۆ ناوچەی بۆتان بۆ کارکردن(٨) .

بەدرخان پاشا جڵەوی ئاسایشی گرتەدەست ، بە بەڵگە باشـترین نموونەی دایەدەست کە میللەتی کورد دەتوانێ زۆر بە باشـی خـۆی بەڕێوەبەرێ ، لـە هەموو ئـەو ناوچە فراوانەی لە ژێردەستی بەدرخـانا بوو لـە کوردستان ، ئاسایش بەجۆرێك ڕەگی داکوتابوو ، وە تەشـەنەی کردبوو ، لـە هیچ ناوچەیێکی تری دەوڵەتی عوسمانیدا بەچاو نەدەکرا . بوونی ئاسایش لە ناوچەکانی بەدرخان بووبـوو بـە نموونـە ، دەووتـرا « منداڵ دەتووانێ بە دەستی پڕ لە زێڕەوە بە هەمـوو وولاتـی بەدرخـانا بڕواو نەترسێ »(٩) .

بێگومان ئەمە نـەك هەر بووە هـۆی ئـەوەی نـاوی بەدرخـانو بزووتنەوەکەی پەرەبسێنێ بەڵکو بووە هۆی ئەوەش ئەوەندەیتر فراوان بێو بڕوای میللەتی پێ زیاد بێ .

کارێکی هەرە گرنگی بەدرخان ئەوەبوو بە چاوێکی دۆستانەو برایانە سەیری کەمە نەتەوەییەیە ناموسوڵمانەکانی دەکـرد وەکـو ئاسـووریو کلدانیو ئەرمەنەکان.باری سەرشانی لەڕووی باجو سەرانەوە سوككردن

---

(٨) ن.ئا خالفین ، خەبات لە ڕێی کوردستانا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ل٥٥ . «بە زمانی ڕووسی» .
(٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٤ .

بگره ئەو ناتۆره دەرەبەگیو کۆنەپەرستانەشی لەسەر لابردن که لێیان بووبوو بە تەوق • جاران دەبوایە دیان یا فەلەیێك لەسەر وولاٚخیش بووایە بهاتایه خوواریٚ ئەگەر دەرەبەگێکی کوردی بدیایە • بە چاوی سووکەوە سەیر دەکران • بەدرخان پاشا ئەمانەی لابردو هاوسانی بەسەر هەموانا سەپاندو بگره هەتا هانی ژنو ژنخوازیشی لەنێوانی موسوڵمانو گاوورەکان دەدا • سەربەستیی ئایینیيان هەبوو ، ئەوە بوو هەر لە بۆتانا نزیکەی هەفتا بنەماڵەی گاوور هەبوونو خاوەنی کلێسەی تایبەتیی خۆیان بووون(١٠) • لەمەش گرنگتر لە پرۆگرامی بزووتنەوەکەیدا بەدرخانپاشا دانی بە مافی ئەم کەمایەتیيانەدا ناو بەڵێنی خودموختاریيان دراییٚ دووای دەستخستنی سەربەخۆیی کوردستان(١١) • ئەمە بزووتنەوەکەی تەواو لەڕووی ناوەرۆكو مرۆڤایەتیيەوە بەرەو پێشەوە بردو ڕوخسارێکی تەواو پێشکەوتووی دایەو هەر لەبەرئەمەش بوو ئەو میللەتانە لەدەوری بزووتنەوەکە کۆبوونەوەو بەدرخانیان بە سەرۆکی خۆیان دانا(١٢) • ئەمەش خۆی لە خۆیدا باشترینو ڕاسترین بەڵگەیە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو ووتە ناڕاستانەی لەلایەن ناحەزەکانی بزووتنەوەکەی بەدرخانەوە وەکو ئیمپریالیستەکانو کارەبەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی دەخرانە تەك بزووتنەوەکەی بەدرخان بەوەی گوایا دژی دیانەکان بێ •

که بەدرخان لە خۆئامادەکردنا گەیشتەئەم ڕادەیە دەوڵەتی عوسمانی تەواو ترسا ، ویستی بە دەمچەورکردن ڕێبازی خەباتەکەی بگۆڕیٚ بەلاٚم

(١٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٥ •

(١١) ئارشاك سافراستیان ، مێژووی کوردو کوردستان ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٣٦ «گۆڕینی لە ئینگلیزیيەوە بۆ کوردی ــ عەبدوڵلاٚ شالی » •

(١٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٦ •

سەرنەکەوت • هەوڵیدا بە فڕوفێڵ لەناوی‌بەرێ ، بەڵام بەدرخان پاشا لە ناپاکیەتی کاربەدەستانی عوسمانی شارەزایی پەیدا کردبوو • دەسەڵاتی بەدرخان پاشا هەتا دەهات پەرەی‌دەسەند ، ناوچەیێکی فراوانی کوردستانی گرتەوە ، هەر لە خوارووی گۆمی وانو ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە هەتا دیاربەکرو مووسڵ بەدەست بەدرخانەوە بوو ، جا کە هیچ شتێك لە وێزەی بەدرخان پاشا نەهات نانەوەی دووبەرەکی ئایینی نێوان کوردو ئاسووری‌یەکان بوو بە باشترین ڕێگە بۆ لێدانی بەدرخانو بزووتنەوەی رزگاری‌خوازی کورد • بە هەموجۆر کەوتنە هاندانی ئاسووری‌یەکان ، ئیمپریالیستەکانیش بەتایبەتی بەریتانیا لە رێی میسیۆنێرە ئایینی‌یەکانیانەوە بەگەرمی چوونە پاڵ دەوڵەتی عوسمانیو کەوتنە هاندانی ئاسووری‌یەکان کە بەدرخانیش دەستی لێیان وەشاند لەپێش هەموانەوە دەنگی ناڕەزایی‌یان بەرزکردەوەو داوای لێدانی بەدرخانیان کرد ، چونکە باشترین هەلیان بۆ هەڵکەوت بەدرخانو بزوتنەوەکەی تێدا لەناوبەرن • لەمڕووەوە لازاریێف دەنووسێ : ئینگلیزەکان ئاسووری‌یەکانیان هانداو هەر خۆشیان کەوتنە گلەیی کردن لای دەوڵەتی عوسمانیو داوای سزادانی بەدرخانیان کرد(١٣) •

ئاسووری‌یەکان بەدرۆو دەلەسەی ئیمپریالیستەکان هەڵخەڵەتانو لە ڕووی بەدرخان‌پاشادا ڕاست‌بوونەوەو ڕازی‌نەبوون بەوەی باجو سەرانەی بدەنێ وەکو جاران دەیاندایێ •

هەموو بزووتنەوەیێك لەپێش هەموو شتێکەوە لەناوەوە خۆی

---

(١٣) لازاریێف ، ل٢٧ •

« بێ گومان سۆن ئەم تاوانە هەر دەخاتە ملی دەوڵەتی عوسمانی و ناوی بەریتانیا نابا کە دەورێکی باڵای‌لەم پەندگێڕانەدا دێ»

کۆدەکانەوەو لە دوژمنی پاك دەکاتەوە ، مەترسی دوژمنی ناوەوە هەمیشـە
لە دوژمنی دەرەوە کوشندەترە • سەرۆك‌و کاربەدەستانی ئاسووری‌یەکانی
هەکاری بـە هاندانـی دوژمنەکـانی هـەردوو لا کـە ئیمپریالیسـتەکان‌و
عوسمانی‌یەکان بوون هەڵخەڵەتان‌و چاویان پۆشی لـە چاکـەو سـوودی
برایەتی‌و ئەو دووارۆژەی دەسـتیان‌دەکەوت ئەگـەر بزووتنـەوەکەی
بەدرخان پاشا سەربکەوتایە ، لەمەش‌دا هەست‌و هوشی ئایینی دەورێکی
باڵای دی ، بـەمـە خۆیـان خسـتە ریـزی دوژمنانـی بزووتنـەوە
رزگاری‌خوازەکەی بەدرخانەوە ، لەمەش‌دا هەر رەشـ‌ورووتەکانیـان
زیانیان پێ گەیشت ، بەدرخان پاشاش بەرەنـگارکردنیانی بـە کارێـکی
نیشتمانی سەرشانی دادەنا ، ئەگینا هەستی ئایینی ئـەو دەورەی نەبـوو •
سۆن لەم‌رووەوە دەڵێ : تورکەکان ئاسووری‌یەکانیان هان‌دا ، دووایـی
بەدرخان پاشاشیان هان‌دا تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە بەو مەبەسەی لەناویان‌بەرێ ،
ئەگینا میللەتی کورد قـەت رۆژێ لـەرۆژان خراپـەی دژی دیانەکـان
نەکردووەو بگرە بەپێچەوانەوە دۆست‌و هاورێ بوون(١٤) •

بەلای بەدرخانەوە مەسەلەکە ئایین‌و ئاسووری نەبوو بەلگەش بـۆ
ئەمە ئەوەیە کە چاوی لە دوژمنێك نەدەپۆشی ، کورد بوایە یا ئاسووری ،
گوایا هەر لە سەرەتای بزووتنەوەکەوە بە چاوترساندن‌و دەست‌وەشاندن ،
ئەو سـەرۆکە کوردانـەی سەرشـکێن نەکرد کـە لایان‌نەدەدایـە لای
بزووتنەوەکەی‌و سەرکیشی‌یان دەکرد ؟ بەڵـێ ! راسـتە بەدرخانیشـ
بەتوندی دەستی لێ وەشاندن ، هەموو جۆرە ناکۆکی‌یێك لەم‌بابەتە لـە
کوردستانا بەئاشت‌بوونەوە براوەتەوە ، بـەڵام ئەمجـارە کاربەدەسـتانی
دەوڵەتـی عوسمانـی‌و ئیمپریالیسـتەکان ئاگـری ناکۆکـی‌یەکـەیـان

---

(١٤) E.B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, 2nd., London, 1926, p. 156.

خۆش دەکردو وازیان نەدەهێناو لەناوەوەو لەدەرەوەش پڕۆپاگەندەیێکی تیژی فراوان دژی بەدرخان پاشاو بزووتنەوەکەی کرا • مەسەلەی ئاسووری یەکانیان کرد بە کراسەکەی عوسمان ، بەونیازەی ناوی بەدرخان پاشاو بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد بزڕێنن ، بگرە توانیشیان ڕای گشتیی جیهانی لێ ڕاستبکەنەوە ، پیلانەکە لەلایەن ئیمپریالیستی بەریتانیاوە دانرابوو • بەریتانیا ڕازی نەدەبوو سەرۆکێکی بەتواناى وەکو بەدرخان بتوانێ میللەتی کورد لە خۆی کۆبکاتەوەو بزووتنەوەیێکی وا ریکوپێكو بەهێزو خاوەن ئامانج لەکایەدا بێ ، ئەگەر یەك ئاسووری خوێنی بڕژایە بەریتانیا ئەمەی هەر دەکرد • ئیمپریالیستی بەریتانیا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دا یەك بوو بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەکە ، ئەم کارەشی بە دەوڵەتی عوسمانی سپارد ، بۆئەوەی تاوانی خوێن ڕشتنی کورد نەچێتە ئەستۆی ، وە بۆئەوەش نەك هەر کورد ، بەڵکو دەوڵەتی عوسمانیش ئەوەندەی تر لاوازبێ و بەوە بتوانێ پیلانەکانی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا بەرێتەسەر •

پەلاماردانی ئاسووری یەکان لەلایەن بەدرخانەوە بوو بە بیانوویێك بۆ دەوڵەتی عوسمانی بە سوپایێکی زۆرەوە هێرش بەرێتە سەر بەدرخان • شان بەشانی ئەوەش ڕۆژنامەکانی ئەورووپاو بگرە هەتا چەند نووسەرێکیش کەوتنە ناوزڕاندنی بەدرخان پاشاو بزووتنەوە ڕزگاری خوازەکەی ، ئەوەتا لایارد دەنووسێ : کاربەدەستانی عوسمانی دووایی توانی یان دەرەقەتی ئەم یاخی بووە بێن کە جارەهای جار سەرکێشی لە ڕووی دەوڵەتا دەکرد • بەدرخان و عوسمان پاشای سەرکردەی هێزی سوپای رێك کەوتن و بەدرخان خۆی دا بەدەستەوە • کاربەدەستانی تورك پیاوانە بەڵێنەکەی خۆیان بردەسەرو بەدرخان پاشایان بەدەست بەسەری نارده دورگەی کاندیا

( شوێنێکەدەکەوێتە دوورگەی «کریت»ەوە ) • ئـەم سزایە گەلێ کەمتر بوو لەوەی لەسەر تاوانەکانی هەڵی‌دەگرت[١٥] •

گومان لەوەدا نی‌یە کە مەسەلەی ئاسووری‌یەکان زیاد لە پێویست زل‌کراو ئەمەش تەنیا بۆ نیازو مەبەسی ئیمپریالیستو کۆنەپەرستەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، سەرۆکەکانی کورد لەترسی ئەوەی دووارۆژی بزووتنەوەکە نەکەوێتە مەترسی‌یەوە پەلاماری ئاسووری‌یەکانیان‌داو لەمەشا کورت‌بینی‌یان کرد ، سەرۆکە ئاسووری‌یەکانیش ساویلکانە بە پیلانی ئیمپریالیستەکان هەڵخەڵەتانو ئەوانیش دڵ‌ڕەقی‌یان پیشان‌دا ، ئەوەتا یەکێك لە بەدیل‌گیراوەکانیان کە مەلەك ئیسماعیلی ناوە دانی بەوەداناوە کە بیست کوردی کوشتووەو بریندار‌بوونەکەی نەبووایە زۆرتریشی دەکوشت[١٦] •

مەسەلەی ئاسووری‌یەکان خرایە قەوارەیێکی‌ترەوەو تەواو زل‌کرا ، ئەگینا لە ڕۆژانی ڕابردوو و نوێدا گەلێك ڕووداوی لەمە خوێناوی‌تر ڕووی‌داوەو باسیش نەکراوەو گەورەش نەکراوە • هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کە شارستانیەت گەلێك پێشکەوتووتر بوو لە ڕۆژانی بزووتنەوەکەی بەدرخان کەچی میللەتانی بەلقان کە دژی دەوڵەتی عوسمانی هەڵسان کوشتارێکی بێ‌ژمارەیان لە موسوڵمانەکان کرد • بێ‌دەنگی ئەوروپاش گەیشتە ڕادەیێك هەتا یەکێك لە ڕۆژنامەنووسەکانی بەریتانیا نامەیێکی بۆ ڕۆژنامەیێکی بەریتانی نووسی تیایا دەڵێ : ئەگەر ئەو دەنگوباسی کوشتارەی پێم‌گەیشتووە ڕاست بێ ، وە هیچی‌واش نی‌یە بەدرۆیابخاتەوە ، ئەم کوشتارەی لەم سەدە نوێ‌یەدا بە ناوی گاووری‌یەوە دەکرێ ، وە ئەم بێ‌دەنگی‌یەمان

(١٥) A. H. Layard. Nineveh and its remains, Vol. 1, London, 1850, p. 783.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٨٨ •

لەم ڕووداوانە هەموو موسوڵمانمان لێ دڵگیر دەکا ، چونکە دەزانن ڕۆژی خۆی چیمان کرد کاتێك کوردەکان یان ئەڵبانی یەکان چەند گاورێکیان کوشت(١٧) .

بالیۆزی بەریتانیا بەتوندی ناڕەزایی دەربڕی و بەڕەسمی داوای لە دەوڵەتی عوسمانی کردو فەرەنسەش لەمەدا پشتی گرت ، کە نووتی بەدرخان بشکێنێ و ئاسووری یەکان بپارێزێ ، بەم جۆرە وەکو لازارێڤ دەنووسێ : « میللەتانی کوردستان یەکەم دەرسیان لە دەستخستنە ناوەوەی دەوڵەتە ئەوروپایی یەکانەوە وەرگرت(١٨) » ، دەوڵەتی عوسمانیش بۆ هەلێکی وا دەگەڕا هەتا تاوانی کورد کوشتنی نەخەنە ئەستۆ ، سوپایێکی بێ ژماری نارده سەر بەدرخان ، بەم جۆرە بزووتنەوەکەی بەدرخان گەیشتە پلەی خەباتی چەکدار بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی گەلی کورد ، ئەو خەباتەی سێ ساڵ بەردەوام بوو ( ١٨٤٣ - ١٨٤٧ ) . لە یەکەم هێرش دا عوسمانی یەکان شکان و بەدرخان پاشاش هەنگاوێکی ئازایانەی هەڵهێنا و بانگی سەربەخۆیی کوردستانی دا(١٩) . بەڵام بەهۆی خەیانەتی یەزدان شێری سەرکردەی هێزیکی گەورەی بەدرخانەوە سوپای عوسمانی توانی ئەو ڕاپەڕینە مەزنە بکوژێنێتەوە(٢٠) .

---

(١٧) الدكتور علي الوردي ، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ، ج٣ ، بغداد ، ١٩٧٢ ، ص١٥٤ .

(١٨) لازارێڤ ، ل٢٧ .

(١٩) محمد امين زكی ، ص٢٥٢ .

(٢٠) سەرچاوەکان بۆ سەرەتاو کۆتایی بزووتنەوەکەی بەدرخان هەندێ جار یەکتری ناگرن ، لەبەرئەوە بەپێی باسەکەو بەکارهێنانی سەرچاوەکان ساڵەکان لەوێ چۆن نووسراوون ، ئێمەش هەروەکو خۆی تۆمارمان کردووە .

## سەرچاوەکان


(١) ڕۆژنامەی کوردستان ، کۆکردنەوەو پێشەکیی دوکتۆر کەمال فوئاد ، بەغدا ١٩٧٢ .

(٢) محمد امين زكي ، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان ، ترجمة محمد علي عوني : القاهرة ١٩٣٩ .

(٣) س.هـ.لونگريك . اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ، ترجمة جعفر خياط ، الطبعة الثالثة ، بغداد ١٩٦٢ .

(٤) ف.ف.مينورسكي ، الاكراد - ملاحظات وانطباعات ، ترجمة وتقديم وتعليق الدكتور معروف خزندار : بغداد ١٩٦٨ .

(٥) م.س. لازارێڤ ، کوردستانو مەسەلەی کورد ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ (بە ڕووسی) .

(٦) د.شاكر خصباك . المسألة الكردية ، بغداد ١٩٥٩ .

(٧) بلەج شێرکۆ ، القضية الكردية ، القاهرة ١٩٣٠ .

(٨) ن.ئا . خاڵفين ، خەبات لەڕێی کوردستان ، مۆسکۆ ١٩٦٣ ، ( بە ڕووسی ) .

(٩) ئارشاك سافراستیان ، مێژووی کوردو کوردستان : گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی : عەبدوڵلا شالی ، سلێمانی ١٩٦٠ .

(١٠) الدكتور علي الوردي ، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ج٣ ، بغداد ١٩٧٢ .

## نووسەرو بەرهەمەکانی :

- سالی **١٩٣٣** لە شاری سلەیمانی لەدایک‌بووە ۰
- قوتابخانەی سەرەتاییو سانەوی لەوێ تەواوکردووە ۰
- **سالی ١٩٥٦ ــ ١٩٥٧ لیسانسی لە جوغرافیا لە (دار المعلمینی عالی) ئیستە ( کۆلێجی پەروەردە) وەرگرتووە ۰**
- لەوساوە هەتا مارتی سالی **١٩٦٠** مامۆستا بووە لە سانەوی **سلەیمانی ۰**
- لە نیسانی سالی **١٩٦٠**دا بۆ تەواوکردنی خوێندن چوو بۆ وولاتی یەکێتی شوورەوی ۰ لە ئامۆژگای روژهەلاتناسی لە شاری لێنینگراد بوو بە قوتابی دکتۆرا ۰
- لە کۆتایی **سالی ١٩٦٣**دا شەهادەی دکتورای لە مێژووی نوێی کوردا وەرگرت ۰
- **لە سەرەتای سالی ١٩٦٤ەوە هەتا کۆتایی سالی ١٩٦٦ ، بوو بە** باحیسی عیلمی لە ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی لە شاری لێنینگراد ۰
- کۆتایی سالی **١٩٦٦** گەرایەوە نیشتمانو بوو بە باحیسی عیلمی لە وەزارەتی کاروباری ژووروو ۰
- لە سالی **١٩٧٠**وە بوو بە مامۆستا لە بەشی کوردی کۆلیجی ئەدەبیات ۰
- لە مارتی سالی **١٩٨١** خانەنشین کرا ۰ لە کۆتایی سالی **١٩٨٣**دا **گەرایەوە وەزیفەو کرا بە خەبیر لە کۆری زانیاری بەشی کوردی ۰**

**بەرهەمەکانی :**

**(۱) لەمەیانی چیرۆکدا :**

١ ـ دە چیرۆک : بەغدا **١٩٦٩** •

٢ ـ خۆری ئاوابوو : دە چیرۆکە ، بەغدا •

٣ ـ راوەبەران : دە چیرۆکە ، بەغدا •

٤ ـ نیوهەنگاو دوور لە دۆزەخ ، دوانزە چیرۆکە ، بەغدا • **١٩٧٩** •

٥ ـ پێنج **تابلۆی شێواو :** دە چیرۆکە • لە ژێر چاپدایە •

٦ ـ گەلێك چیرۆکی‌تر چاوەروانی دەرفەتێکی بلاوکردنەوەن •

**(٢) لە مەیانی مێژوودا :**

١ ـ **شۆڕشی ئاگری‌داغ ( بە ناوی کاکەی رێبوارەوە بلاوی‌کردۆتەوە )** سلەیمانی ١٩٦٠ •

٢ ـ مێـــژووی حوکمدارانی بابان • توفیق قەفتـــان لـــە فارسیەوە کردوویەتی بـــە کوردی • ســـەرلەنوێ نووسینەوەو دارشتن‌و تەعلیقی نووسەر •

٣ ـ بزووتنەوەی رزگاری کورد لە شـــەری گێتی یەکەمـــەوە **تا کۆتایی** شەری گێتی دووهەم • (ئەترووحەکەیەتی) • هێشتا دەستنووسە•

٤ ـ **(بزووتنەوەی رزگاری کورد لەدووای شـــەری گێتی دووهەمەوە)**

**ئەو کتێبەیە کـــە لەوماوەیەی باحیسی عیلمی بوو لـــە لێنینگراد بۆ** دانشگای روژهەلات‌ناسی ئامادەکرد • هێشتا دەستنووسە •

**(٣) لە مەیانی وەرگێراندا :**

١ ـ کتێبی (ئەفسانەو رەمز) جـوبرا ئیبراهیم جوبرا لـــە ئینگلیزیەوە کردوویەتی بە عەرەبی‌و نووسەریش کردوویەتی بە کوردی • لە

دەستگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوە چاوەروانی بڵاوکردنەوەیە •

٢ ـ (ئەفسانەی میللەتانی رۆژهەڵات) لە رووسیەوە کراوە بە کوردی• نیوەی یەکەمی لەژێر چاپدایە • (ئەمینـداریتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان بڵاوی ئەکاتەوە ) •

٣ ـ حیکایەتە گەورەکانی جیهانی • لە عەرەبیەوە کراوە بـە کوردی لەلایەن دەستگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوە لەچاپ‌ئەدرێت‌و لەژێر چاپدایە •

٤ ـ (چیـــرۆکی هەڵبژاردە) ژمارەیەکی گەورەی چیروکی پرمـــانای رۆژهەڵات‌و رۆژئاوایە • لـە دەستگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنـەوە چاوەروانی بڵاو کردنەوەیە •

٥ ـ چوار چیرۆکی ئەفسانەیی گەورەی تاجیکی لە رووسیەوە کراوە بە کوردی • دووانیـــان بڵاوکراونەتـــەوەو دووانەکـــەی‌تریش بڵاوئەکرێنەوە •

٦ ـ (کوردستـان‌و مەسـەلەی کورد) نووسینی لازاریێف • کتێبێـکی زۆر گەورەو بەنرخە ، هـەر پەراوێزەکانی **بەکوردی (١٢٠)** پەرەیە چەند ساڵە چاوەرێی بڵاوکردنەوەیە •

٧ ـ (کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) ، **نووسینی** دکتور جـەلیلی جاسم • لە رووسیەوە کراوە بە کوردی • لە دەستگای روشنبیری‌و بڵاوکردنەوە چاوەروانی بڵاو کردنەوەیە •

٨ ـ راپەرینی کوردەکان لە ساڵی ١٨٨٠دا • نووسینی دکتور جـەلیلی جاســـم • بەسەرهاتی شورشەکـەی شێخ عوبەیدوللای نەهریە بەدەستەوەیەو بەمزووانە تەواو ئەبێت •

٩ ـ ووتاروو شیعری لاوەکی • پێویست بە ناوهێنانیان ناکات •

# ناوەڕۆک

الدكتور كاوس قفطان

# دراســـات
# في تاريخ بابان و سوران و بوتان

كتب مقدمتها
الدكتور كمال مظهر احمد

بغداد ـ ١٩٨٥

Dr. Kawus Qaftan

# STUDIES
# IN THE HISTORY OF
# BABAN, SORAN AND BOTAN

*Introduced by* :
Dr. Kamal Madhar Ahmad

Baghdad - 1985

---

نرخى ( ٧٥٠ ) فلسه

مطبعة الحوادث ـ هـ ٤١٥٢٦٨٥